لە بڵاوكراوەكانی
كتێبی ئاینی، فیركاری، رۆمان، چیرۆك، فەلسەفە، رۆشنبیری، منداڵان
كتێبخانەی بەختیاری
Bakhtiary Book Shop
سلێمانی ـ شەقامی مەولەوی ـ بەرامبەر چاپەمەنی دیلان
٠٧٤٨٠١٥٥٧٠٥

ناوی كتێب :سودەكانی خواردن لەسەر لەشی مرۆڤ

نووسینی: ساماڵ علی حەمە بچكۆل

بەرگ: ساماڵ علی حەمە بچكۆل

دیزاین: ساماڵ علی حەمە بچكۆل

تیراژ: ٥٠٠٠

چاپی دووەم: ٢٠١٤

چاپ:چاپخانەی چوارچرا

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانەی گشتییەكان ژمارە سپاردنی ( ٢٠٧٩ )ی ساڵی( ٢٠١٣ )ی پێدراوە.

## پێشەکی

دوای تێپەڕ بوونی ٧ ساڵ ، تەواو بووم لە نووسنی ئەم پەرتوکە،
وە ئێستا هەست بە دڵخۆشی دەکەم لە نووسینی دوا وشەم لە پەرتووکەکەمدا.
بۆچی پە رتوکێکی لەم شێوەیە ؟
چونکە نوسینی ئەم جۆرە پەرتوکانە سوود و گرنگی زۆری هەیە بۆ هەموو مرۆڤێک کە بیەوێت تەندروست بژی و وە سودی لێ وەربگرێت .
زۆرێک لە مرۆڤەکان کەمتر زانیاری یان هەیە لەسەر ئەو خۆراکانەی کەسوودیان هەیە , لەبەر ئەوە گرنگە ئەم جۆرە پەرتوکانە بناسن وە دەتوانن ئەم جۆرە خۆراکانە بخۆن چونکە دڵنیایی لە باشی و سوودی ئەم جۆرە خۆراکانەدا هە یە.
پێم خۆشە ئەو زانیاریانەی کە دەیزانم بیبەخشمە هەموو کەسێک بۆ ئەوەی سوودمەند بن ، وە هەموو مرۆڤێک بە شێوەی تەندروست بژی و ئاگاداری خۆیان بن ,لەبەر ئەوە من هەستاوم بەنوسینی ئەم پەرتوکە چونکە کەسی خۆشەویستم لە دەست داوە بە نە خۆشی شێرپەنچە .من نامەوێ بڵێم کە لە نەخۆشی شێرپەنجە ڕزگارت دەبێت دەتوانم بلێم کە ژیانێکی تەندروستت دەبێت وە
لەزۆر نەخۆشی دەتوانیت خۆت بپارێزیت وە ئێمە پێش ئەوەی کە توشی نەخۆشیە ترسناکەکان ببن ئەتوانین بە زانینی ئەم زانیارانە خۆمان بپارێزین من دەتوانم پێت بڵێم بە پەرتوکێکی ناوا لە زۆر نەخۆشی دوورتان دە خا تە وە وە ژیانێکی تەندروستان دەبێت.

بۆیە بە فکری من بۆ هەموو تاکێک و کۆمەلێک ئەم پە رتوکە پێویستە .
زۆر بە سودە بۆ چەند ها نەخۆشی یاخود ڕێگرە یان وەستێنەرە
لە نەخۆشیەکان یاخود دەتوانم بڵێم دە رمانە بۆ زۆربەی زۆری نەخۆشیەکان.

# پێڕست

## پەتاتە



مێژووی پەتاتە لە وڵاتی باشوری ئەمەریكا پەیدابووە لەوێ وە هاتووە لە وڵاتی ( peru ) وە بڵاوبۆتەوە بە هەموو جیهاندا. وە خۆراكێكی سەرەكی ئەوروپایە بە تایبەت لە وڵاتی هۆڵەندا. وە دەوڵەمەندە بە زۆر مادە وەك ڤیتامین b-b٢ ڤیتامین c ) هەروەها مەگنسیۆم و فسفۆڕ و پۆتاسیۆم و چارەسەرێكە بۆ ڕەش بوونی ژێرچاو. هاڕینی پەتاتە ( ئاوی پەتاتە ) وە تێكەڵ كردنی لەگەڵ چەند قەترەیەك ئاوی لیمۆدا ١ كەوچكی چا ڕۆنی گوڵەبەڕۆژە دەیخەینە ژێر چاومان، چارەسەرێكە بۆ ئەو ڕەشییەی كە لە ژێر چاوماندا دروست دەبێت.

پەتاتە بە كوڵاندنی زۆر سوودی لێدەبینین یان بە توێكڵەوە بەكاری بهێنین لە خۆراكەكانماندا لەبەر ئەوەی كە ماددەیەكی خۆراكی تێدایە ڕاستەوخۆ لە ژێر توێكڵەكەیدا. ئەم مادەیەش باشە بۆ قژ و نینۆك. ئەگەر پەتاتە بەبێ توێكڵ بخورێت ئەو گرنگی و سوودەی نامێنێت كە لە پێشتر دا باسمان كرد. وە لە هەمان كاتدا بۆ ئەو كەسانەی كە ئەندامەكانی لەشیان تووشی هەڵئاوسان دەبێت و ورد كردنی پەتاتە و سان بەشێوەی ئاو لەسەر ئەو شوێنانە دابنێین كە توشی هەڵئاوسان دەبن بۆ ماوەیەكی دیاریكراو تا هەڵئاوساوییەكە دەنیشێتەوە.

پەتاتە كاریگەرییەكی زۆری هەیە لەسەر هەوكردن و خواردنەوەی ( پەرداخی بچوكی ئاوی پەتاتە ئەبێتە هۆی باشكردنی لینجییەكانی نێوان ئێسكەكان ).

وە خواردنی ئاوی پەتاتە واتە گوشینی پەتاتە لە ژەمە خواردنەكاندا دەبێتە هۆی باشكردنی ئازاری گەدە و كێشەكانی گەدە.

**سوودە تەندروستییەکانی پەتاتە :**

**١-سکچوون: زۆر باشە و دەوڵەمەندە بە وزەی سیستەمی خۆراکی بۆ ئەو نەخۆشانەی کە توشی سکچوون بوون، لەبەر ئەوەی هەرس کردنی زۆر ئاسانە بەڵام زۆر خواردنی لەوانەیە ببێتە هۆی سکچوون بەهۆی زۆری نیشاستە تیایدا.**

**٢-رۆماتیزم: دوو لایەنی ئەم کاریگەرییە هەیە. ڤیتامین و کالسیۆم و مەگنسیۆم لە پەتاتەدا فریاگوزاری دەبەخشێتە رۆماتیزم. ئاوی پەتاتەی کوڵاو یاریدەی چارەسەری رۆماتیزم دەکات. بەڵام لەبەر زۆری نیشاستە و کاربۆهیدرات دەبێتە هۆی زیادبوونی کێش، کە ئەمەش ئەنجامی خراپی بۆ ئەو کەسانە دەبێ کە رۆماتیزمیان هەیە.**

**٣-هەرس کردن: پەتاتە هەرسکردن و وەرگرتنی لە کۆئەندامی هەرسدا ئاسانە. ئەمەش وادەکات کە پەتاتە لە سیستەمی خۆراکی باشدا بێت بۆ نەخۆشەکان و ئەوانەی کە هەرسکردنیان باش نییە، پەتاتەی کاڵیش رێژەیەکی باشی ریشاڵی تێدایە.**

**٤-گرنگی دان بە پێست: ڤیتامین b و c ئاوێت و کانزاکانی وەك پۆتاسیۆم و فسفۆر و مەگنسیۆم و زینك بۆ پێست باشن، دەتوانرێ لە کرۆکی پەتاتەی کاڵدا دەست بکەوێت و لەگەڵ هەنگوین تێکەڵ بکرێ بە وردکراوی بۆ پێستی دەم و چاو زۆر باشە. ئەمەش رێگری لە دروست بوونی پەڵە و چاڵی دەکات لەو پێستەدا. دەتوانرێ کرۆکی پەتاتە لەسەر رووی دەرەوەی سووتاوی دابنرێ زوو چاك دەبێتەوە ، ئەو ئاوەی لە لەت کردنی پەتاتەدا دەردەچێ بە سوودە بۆ پاك کردنەوەی پێست بەتایبەت لە دەوری ئەو پەڵە و نیشانانەی کە لەسەر پێست دەرکەوتوون.**

**٥-ئەسکە پووت: ڤیتامین c لە پەتاتەدا دەتوانێ یارمەتی بدات لە رێگری توشبون بەو نەخۆشیە کە بەهۆی کەمیی ڤیتامین c یەوە روودەدات، یاریدەی پووك و ناو پۆشی دەم دەدات لە خوێن بەربوون و هەوکردنی ڤایرۆسی چەند جارە.**

**٦-هەوکردن: پەتاتە لە کاتی هەوکردن زۆر کاریگەرە چ لەناوەوە بێت یان لە دەرەوەی**

لەش، نەرمە و هەرسی ئاسانە ڤیتامین c زۆری تێدایە، ( دژە ئۆکساندنی زۆر باشە ) و ڤیتامین b و پۆتاسیۆم ئیلتیهابی کۆلۆن و کۆئەندامی هەرس خاو دەکاتەوە. بەڵکو سیستەمێکی خۆراکی زۆر باشە بۆ ئەوانەی بڕینی ناو دەمیان هەیە.

٧-زۆر بوونی کێش: پەتاتە ڕێژمیەکی زۆر کاربۆهیدرات و ڕێژمیەکی کەم پرۆتینی تێدایە. ئەمەش وادەکات سیستەمێکی خۆراکی نمونەیی بێت بۆ ڕەشیق بوون، ئەمەش یاریدەرە بۆ کەم بوونەوەی کێش، ڤیتامینەکانی وەك b و c ئاوێتە یاریدەرە بۆ مژینێکی تەندروست ئەو کاربۆهیدراتە ، ئەمەش گرنگی زۆری بۆ ئەوانە هەبوو کە زۆرانبازی سومۆ بوون.

٨-بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن بەهۆی چەند شتێکەوە یە لەوانە شەکرە و ڕاڕایی قورسی هەرس کردن، سروشتی خۆراك، دەتوانرێ پەتاتە بۆ مەبەستی چارەسەری ئەم حاڵەتە بەکاربهێنرێ، بەڵام دەبێ لە حاڵەتی شەکرەدا خۆ دوور بگیرێ لە ڕیشاڵەکانی گرنگن بۆ دابەزینی کۆلیسترۆڵ و کاریگەری ئەنسولین لەسەر لەش باش دەکات، یاریدەی دابەزینی پەستانی خوێن دەدات، لەگەڵ نەبوونی پەیوەندی لە نێوان پەستانی خوێن و ئاستەکانی شەکر لە خوێن دا و ئەنسولین ئاستی گلوکۆز ڕێکدەخات.




٩-دەماغ: کارکردنی دروست دەماغ پشت بە ئاستی بوونی گلوکۆز و ئۆکسجین دەبەستێ. کۆمەڵەی ڤیتامین b و هەندێ هۆرمۆنات و ترشە ئەمینییەکان

و ترشە چەورییەکان وەك ترشی ئۆمیگا ٣ ی چەوری. پەتاتە بەنزیکی هەموو پێویستە خۆراکییەکان دابین دەکات. پەتاتە دەوڵەمەندە بە کاربۆهیدرات وە بۆیە ئاستێکی باشی گلوکۆز ڕادەگرێت لە خوێن دا. پارێزگاری لە چالاکی و بەئاگابوونی مێشك دەکات. ئاسنی تێدا هەیە وە ئەمەش شتێکی باشە بۆ گواستنەوەی ئۆکسجین.

١٠-نەخۆشی دڵ: جگە لە ڤیتامینەکانی (b کۆمپلێکس، cج) و مینێراڵەکان و سلیلۆز پەتاتە هەندێك شتی تێدایە کە پێی دەڵێن (تین ، زیاکسانتین هتد) کە بەسوودە بۆ دڵ و ئۆرگانەکانی تری هەناو.

١١-بەردی گورچیلە : کە دروست دەبێت بە شێوەیەکی سەرەکی بە زیادبوونی ئاستی ترشی یۆریك لە خوێندا. لەم جۆرە بارودۆخانەدا، پرۆتینە بەرزەکان دەتوانرێت خۆپارێزی لێ بکرێت، بە تایبەتی پرۆتینی ئاژەڵی وەك گۆشت، قەل، قرژاڵ ، ماسی دەریا، هێلك، شیر، هتد... وە سپیناخ و مۆز و دانەوێڵەی رەش و فاصۆلیای تایبەت ، کە زۆر ئاستی ترشی یۆریك بەرزدەکاتەوە (لەوانەیە ئەم شتە ڕووبدات).

پەتاتە دەوڵەمەندە بە مەغنسیۆم، کە بەرگری دەکات لە نیشتنەوە و تۆپەڵ بوونی کالسیۆم لە گورچیلە و شانەکانی تری لەش، ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت کە وا بۆ چارەسەرکردنی بەردی گورچیلە بەسوودە.

١٢-سوودەکانی و سیفەتەکانی تر و هۆشداری کردنەکان: گیراوەی پەتاتە ئەنجامی باش دەدات لە چارەسەرکردنی سووتاندن و کوتان و هەڵگەڕانەوەی ئێسقان و کێشەکانی پێست و برین و کارکردنی مادده بێهۆش کەرەکان، وە شێرپەنجەی پرۆستات و ڕەحم و دروست کردنی کێم و برین یان پەمیان و ئاوسان. لەلایەکی ترەوە لایەنە نەگێتیڤیەکان دەبێت لەچاوبگرێت کە لە پەتاتەدا هەن. پەتاتەی سەوز ژەهراوییە وەك گەڵای پەتاتە و میوە، چونکە مادەی ئەلکەلاین وەك سولانین ، chaconine و زەرنیخ کە ژەمێکی زیاد لێی کوشندە دەبێت. وە سەرەڕای ئەوە ، دەرخەری ڕێژەی شەکر لە خوێن دا (بەسادەیی، پێکهاتەی وزە و شەکر) لە پەتاتە دا زۆر بەرزە (سەرووی ٨٠) ، وە دەبێت بە ئاگایی بەکاربهێنرێت لە لایەن کەسانێ کە قەڵەویی و نەخۆشی شەکرەیان هەیە.

ئامۆژگاری...

١- پەتاتە شتێكی باشە (بەسوودە) بەڵام لە بیرت بێت كەوا چەوری زیاد لە ورگ كێشە دروست دەكات لە ڕەپ بوونی چۆك.

٢-كوتان و ئاوسان دەكرێت چاك بكرێتەوە لە پێڵووی چاو بە پەتاتەی ورد كراو ، وە دوای چەند سەعاتێك لە ئاوسان بە ڕەنگ بوون دەكرێت هێورتر ببێتەوە بە شێوەیەكی بەرچاو. وە هەمان شت ڕوودەدات لە كوترانی. كاتێك كە پەتاتە بە تەنكی دەبڕدرێت یان كە دەكرێت بە نان، بەرزی چەوری لە ماددەی ئەكریلامید كە مادەیەكی ژەهراوییە دروست دەبێت لە خۆراكی ئەشەوییات كاتێك كە مامەڵەی لە گەڵ دەكرێت یان لێدەنرێت لە پلەی گەرمای بەرز.

٣-ئەكریلامید بۆی هەیە كە وا سەرەتان (شێرپەنجە)، بەڵام نەزانراوە كە ئەم شتە چۆن مەترسیدار دەبێت بۆ مرۆڤ ئەم مادەی ئەكریلامیدە. لە بەرزترین ئاستی ئەكریلامید ، بەڵام ئاست بەرزی و بەكارهێنانی و ماددە دژی بە ئۆكسید بوون كە هەوڵ دەدات ئاستی ماددەی ئەكریلامید لە پەتاتە بێنێتە خوارەوە.

## شلیك



شلیك چەند چەوریەکی بنچینەیی تێدایە وەك گلای سیدین ئەنتۆسیانین، و ناوێتەکانی گۆگرد، وە پیکتین وە شەکرەکانی میوە، سەرباری ڤیتامینەکانی( C ,B1, B2, B9, A ) وە هەروەها فسفۆر و سۆدیۆم و گۆگرد و ئاسن و کالسیۆم و ترشی سلیکۆنی یۆدیشی تێدایە. شلیك بۆ خاوێن کردنەوەی خوێن و بەهێزکردن و نەرم کردن و پێکهاتەکەی کاردەکات. هەروەها کاریگەری هەیە لەسەر هاندانی گورچیلەکان و هەواگۆڕکێ، دەتوانرێت شلیك بۆ چارەسەری هەوکردنی جومگەکان و ڕۆماتیزم و لینجییەکانی بەینی جومگەکان. شلیك کاریگەری لەسەر بەهێزکردنی دڵ و خوێنبەرەکان هەیە هەروەها لەسەر پەستانی خوێن و دەتوانرێت بەکاربهێنرێت وەك هۆکارێك بۆ چارەسەری کەم خوێنی و گرفتەکانی سووڕی خوێن. مەنگەنیز و کانزاکان دەورێکی گرنگیان هەیە لەم بوارەدا واتە لە دروست بوونی ئێسك و ئەقڵ و کۆئەندامی دەماردا ( هەستەوەرەکان ) ,هەروەها دەتوانرێت سوود لە گەڵاکانی ببینرێت بەکاربهێنرێت، بۆ نموونە بەکارهێنانی بۆ دروست کردنی چا کاریگەری سوتانی بەر خۆر کەم دەکاتەوە بە جۆرێك ئەتوانین توێژاڵەکانی شلیك یاخود بە کوتراوی لەسەر پێست دابنرێت بۆ چارەسەر. شلیك کاریگەری هەیە لە خاوێن کردنەوەی پێست دا میوەیەکی گونجاوە بۆ چارەسەری پێستی چەور و فراوان کردنی کونیلەکانی پێست وادەکات سیمای دەم و چاو بپارێزێت لە پیری واتە کەمتر پیر دەربکەوێت. وە پێستیش لە هەندێ نەخۆشی سووربوونەوەدە پارێزێت وە هەروەها شلیك سوودی بۆ ددانەکان هەیە وادەکات ددانەکان زیاتر سپی

بـبن و لـه هەنـدێ نەخۆشـیەکانی دووردەخاتـەوە وەك نـەوەی لـەنێوان جگەرەکێـشەکاندا ڕوودەدات لـە پاشمـاوەی پەلـەکانی دوکـەڵی جگـەرە. دەتوانرێـت شـلیك بـەکاربهێنرێت بەشێوەیەکی فراوان وە بۆ چارەسەری ئەنفلۆنزا و نەخۆشییەکانی دابەزینی پلەی گەرمی .

سووده تەندروستییەکانی شلیك :

١-مەنگەنیز بەسوودە بۆ ئێسکەکان یارمەتی دەرە بـۆ دروست بـوون و ڕێـك بـوونی ئێـسکە پەیکـەر هـەروەها تـوخمی پۆتاسیۆم و مەگنـسیۆم و ڤیتـامین k لـە شـلیك دا گـرنگن بـۆ تەندروستی ئێسکەکان.

٢-هەوکردنی جومگەکان لینجی نێوانیان. گرژبوونی کرانـەوەی ماسولکەکان و شـانەکان و وشك بوونەوەی ئەو شلانەی لە لەشدا کـە یاریـدەی گواسـتنەوەی جومگـەکان دەدات وە مـادە ژەهراویە کۆبوەوەکان و ترشـەلۆکەکان ( وەك ترشـی یۆریـك ) ئەمانـە هەنـدێك کاریگـەری خرا پیان هەیە کە لە ڕەگە سەربەستەکاندا دروست دەبێت و کە لێپرسراون بە پلەی یەك لە هـەوکردنی جومگـەکان و لینجییەکـەی نێوانیـان. شـلیك وەك مادەیـەکی دژە ئۆکـسیدی کاردەکات و دەتوانێت بە شێوەیەکی کاریگەر لە زیانە تەندروستییەکانی بمان پارێزێت.

٣-شێر پە نجە : ڤیتامین c و ئەنتۆسیانین کا یمیفرول کیریستین ( هەنـدێك لـە ئاوێتـەکانی فلافونویت لە شلیك دا زۆر باشە لە تایبە تمەندیانا لە دژە ئۆکسان و دژە شێر پە نجەدا بـە پێکهاتەیەکی زۆر باش دادەنرێت لـە چارەسـەری قەڵاچۆکردنی شێر پە نجە و لووەکانـدا. بەکارهێنانی ڕۆژانە ئەبێتە هۆی پارێزگاری کردن لە دروست بوونی خانەکانی شێر پە نجە.

٤-گرنگیدان بە چاوەکان :. هۆکارە سەرەکیەکانی هەموو ئەو گرفتانەی چاو دەگەڕێتەوە بـۆ ڕەگە بەکتریاکان و کەمی هەندێك توخمی خۆراکی. لە سەردەمی پێشوودا بە نـەبوونی ئـەم مـادە خۆراکیـە پـارێزەرە نـەدا و ئۆکـساندنی ڕەگـە سەربەسـتە زیـان بەخـشەکان یـاخود ڕاکێـشانی تەنۆلکـە زیـان بەخـشەکان بـۆ نـاو چـاو وەك وشـك بونـەوەی چـاو و دەمـارە بینـاییەکان و شیبونەوەی پەڵە زەردەکان ، کەم و کـورتی لـە بیـنین دا وە ئەمـەش وادەکـات

زیاتر تووش بوون بە نەخۆشی ئاسان بکات. دژە ئۆکسینەرەکانی وەك ڤیتامین c ، فلافۆنۆین، فینۆڵ و ترشەڵۆکی مادە کیمیاوییەکان Acid لە شلیکدا لەم جۆرە نەخۆشیە دەمان پارێزێت هەروەها کاریگەریەکی تر لە پەستانی چاودا واتە پەستان لە چاوەکاندا یان شێواندن لە چاودا زیان بەخشە بۆ چاوەکان شلیك بەسوودە بۆ ئەمانەش . مادەی پۆتاسیۆمی تێدایە کە چاو دەپارێزێت لەو جۆرە پەستانە.

٥-دەماغ: .گەورە ساڵان تووشی کەمی کۆنترۆڵ کردنی بیرکردنەوە و چالاکییەکانی دەبن ئەمەش دەگەڕێنرێتەوە بۆ پیربوون و هزر و کۆئەندامی دەمار یان ڕەگە سەربەستەکان لێپرسراون لە دروست بوونی پیریدا کاریگەری زۆر خرا پیان هەیە لەم سیستەمەدا . دەماغ و دەمارەکان لاواز دەکات. ڤیتامین c مادە ڕوەکیەکان لە شلیکدا کاریگەری هەیە لەسەر ئۆکساندن یان گەنج بوونەوە و هەروەها دەوڵەمەندە بە یۆد کە ئەمەش زۆر بەسوودە لە باش بەڕێوەچوونی هزر و کۆئەندامی دەمار.

٦-بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن: شلیك ڕێژەیەکی زۆر پۆتاسیۆم و مەگنسیۆمی تێدایە کە هەردوکیان کاریگەرن لە دابەزینی ئەو پەستانە خوێنەی بەهۆی ( NA ) سۆدیۆم دروست دەبێت

٧-نەخۆشییەکانی دڵ. مادە ڕیشاڵیەکان و ڕۆنی تیانیە و بەشێکی زۆری دژە ئۆکساندن وەك ڤیتامین c و مادە ڕوەکیەکان ( فلافۆنۆی دات ) پێکەوە ڕۆڵی گرنگ دەبینن لە تەندروستی دڵدا ئەمانە کاریگەرییان هەیە لە سەر کۆلیسترۆڵ هەندێ لە تاکەکانی خێزانی ڤیتامین B لە ئێستادا لە شلیکدا بەسوودن بۆ چالاك کردنی ماسولکەکانی دڵ و یاریدەی چاکی ئەرکی دڵ دەکات.

٨-دانەکان. شلیك بەتامە وە بەسوودیشە بۆ دانەکان لەکاتی خواردنیدا ددانەکان سپیدەکاتەوە لەبەر ئەوە بۆ زەردنەبوونی ددان باشە.

٩-کاریگەرییەکانی تری: وەك زانراوە یارمەتی دەرە لە پاراستنی لە شێواندنی دروست

**بوونی لەش ( بۆ ئەو منداڵانەی کە بە شێوەیەکی نا تەندروست لە دایك دەبن ).**

**پێکهاتەی شلیك لە ١٠٠ گرام:**

**کالسیۆم: ٢٥ملگ فۆسفۆر: ٣٠ ملگ کیلۆکالۆری: ٣٣ ملگ**
**پۆتاسیۆم: ١٥٠ ملگ ڤیتامین C: ٦٤ ملگ.**

## قەیسی



قەیسی میوەیەکی کۆنە لای چینی یەکان. چاندنی قەیسی بۆ یەکەم جار لە ئەوروپا دەگەڕێتەوە بۆ پێش لە پێنج یان شەش هەزار ساڵ بەر لە ئێستا. بە شێوەیەکی تایبەت بەدی دەکرێت لە ناوچەی دەریای ناوەڕاست. ڕنینی قەیسی ئەنجام دەدرێت لە مانگی حوزێراندا.

بڕێکی کەمی ڕەوانەی بازار دەکرێت و زۆرینەی وشك دەکرێتەوە و لە بەرهەمە پیشەییەکاندا بەکار دێت.

لە سەدەکانی ١٥دا قەیسی بەکارهێنراوە لە لایەن ئەغریق و ڕۆمانیەکانەوە بەڵام قەیسی بەشێوەیەکی ئاسان لە ئیتالیا و فەرەنسا بەدەست نەکەتووە. سوود وەرگرتن لە قەیسی وەك میوەیەك تام و چێژی خۆی هەیە، یان بەشێوەی شەربەت، هەمان سوودی هەیە چونکە تامی کۆمبۆتی تیادا نیە. قەیسی ماددەی کارۆتینی (ڕەنگی پرتەقاڵی: ١,٥٠٠غم/١٠٠غم) تیادایە، کە بەکار دێت وەك تایبەتمەندیەکی فرە باش بۆ ماسولکە و پێست. هەروەها قەیسی گەرمۆکەیەکی گەرمی کەمی تیادایە (٤٥ بۆ هەر ١٠٠غم) و تەنها ڕێژەی ١٠٪ لە کاربۆهیدرات.

مەترسی بەدەست هێنانی چەوری زۆری نیە، هەروەها ریشاڵێکی زۆری تیادایە، کە لە چەندین میوەی تردا نیە. بەڵام کەم و کورتی قەیسی لە لاوازی ڤیتامینی دایە، لە هەر ١٠٠ غم دا ٧ ملغم بەدەست دێت. قەیسی بریتیە لە سەرچاوەی فیتامینە ووزە بەخشەکان، وەك فیتامینی C و ئاسن و بۆتاسیۆم و ریشاڵ و فیتامینی ئەی. دەکرێت قەیسی وەك میوەیەکی تازە یان ووشك کراو یان لە پاکەت گیراو بەکار بێت.

سووده تەندروستیەکانی قەیسی بریتیە لە توانای قەیسی بۆ چارەسەرکردنی بەد هەرسی، قەبزبوون، ئازاری گوێ، تا، سەرەتان، و نەخۆشیەکانی پێست و کەمی خوێن. زەیتی قەیسی بەسووده بۆ چارەسەرکردنی شلەژانی ماسولکەکان.

پێشبینی دەکرێت کە قەیسی بەسوود بێت بۆ چاودێریکردنی پێست، بەتایبەت بۆ ڕەگەزی مێ. بۆیە، بەکاردێت لەگەڵ پێداویستیەکانی جوانکاریدا.

سووده تەندروستییەکانی قەیسی:

١ چالاك کردنی کاری هەرس کردن، چونکە یارمەتی هەرسبوون دەدات. بەڵام دڵنیابە لەوەی کە بڕێکی زۆر بەکار نەهێنیت بەشێوەیەك بۆخۆی ببێت بە ژەمێکی تر

٢ یارمەتی دەدات لە خۆرزگارکردن لە بەرماوە چەوریەکان چونکە قەیسی ڕێژدیەکی کەمی لە چەوری و کالۆری تیادایە. دەتوانیت پاش هاڕینی قەیسی لەبری قۆخ، شەربەتی سێو یان زەیتی کالۆری بەرز بەکاربێنیت.

٣ دەرمانێکی باشە بۆ چارەسەرکردنی لاوازی خوێن. کەمی خوێن دروست دەبێت بەهۆی کەمی ڕێژەی خرۆکەی سور. خرۆکەی سور ڕێژەیەکی کەمی لە هیمۆگلۆبین تیادایە و ئەوەش ڕوودەدات بەهۆی کەمی ئاسنەوە. قەیسی ووشك کراو ڕێژەیەکی زۆری لە ئاسن تیادایە و ئەو ڕێژەیە دەبێتە چارەسەرێك بۆ کەمی خوێن.

٤ شەربەتی قەیسی بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی چەندین نەخۆشی بە بەکارهێنانی لەگەڵ هەنگوین یان شەکر وە یارمەتی جەستە دەدات بۆ نزمکردنەوەی پلەی گەرمای جەستە لەکاتی تا دا. جگە لە بەکارهێنانی بە مەبەستی تینوێتی شکاندن و کۆکردنەوەی پاشماوەی خواردن لە جەستەدا، هەروەها بەسووده بۆ چاوو گەدە و دڵ و دەمارەکان بەهۆی لەخۆگرتنی بۆ ڤیتامین و کانزاکان.

٥- بۆ چارەسەکردنی قەبزبوون. بەهۆی لەخۆگرتنی قەیسی بۆ ماددەی بەکتین و سیلیلۆز هەڵدەستێت بە شلکردنەوەی خواردنەکان بە ئاستێکی گونجاو. ئەگەر هاتوو قەبزبوونی بەردەوامت هەبوو ئەوا دەتوانیت ڕۆژانە ٦-٨ قەیسی بەکاربێنیت بۆ گەڕانەوەی باری ئاسای .

٦ -چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی پێست. دەتوانیت پەڕەکانی قەیسی بۆ سوتانی بەرخۆر ئەکزیما و کشانی و خورانی پێست بەکاربێنیت.

پیکهاتەی قەیسی لە ١٠٠ گرام:

کالسیۆم: ١٦ ملگ

فۆسفۆر: ٢٠ ملگ

ئاسن: ٢٠ ملگ

کیلۆ کالۆری: ٥٦ ملگ

پۆتاسیۆم: ٢٨٠ ملگ

C ڤیتامین : ٩ ملگ

## سێپەڕە

سێپەڕە ڕووەکێکە، لە زۆر بواری فراواندا بەکاردەهێنرێت وەکو ئالیك بۆ ئاژەڵ و وە زۆر جار وەك خۆراکی مرۆیی بۆ مرۆڤ بەکاردێت. سێپەڕە لە ماوەی سەدەی هەشتەمی پێش زایین ڕوێنراوە، لە نێوان گەلاندا گرنگییەکەی دەرکەوتووە لەسەرەتای سەدەی حەڤدەیەم دا. وە خەڵك سێپەڕە بەکاردەهێنن لە هەموو جیهاندا لە پێناو هاریکاری گشتی دا. سێپەڕە وەکو سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند دەگەڕێتەوە بۆ کانزاکانی کالیسیۆم و مەگنسیۆم و فۆسفۆر و پۆتاسیۆم و



ئاسن، وە یەکێکە لە باشترین سەرچاوەکانی پرۆتین. وە زۆر دەوڵەمەندە بە کارۆتین و کلۆرۆفیل و ڤیتامینەکانی A, D, E, B-٦, K ، و ئەنزیمە هەرس کەرە جیاوازەکان.

سووده تەندروستییەکانی سێپەڕە:

١- سێپەڕە یەکێکە لە زۆرترین ئەو ڕووەکانەی خوێندنەوەی لەسەر کراوە کە دەست دەگرێت بەسەر ئەو خۆراك و کەرەستە کیمیاییانەی کە لە گەدە و جگەردا هەن کە دەبنە هۆی شێرپەنجە.

٢-خواردنی سێپەڕەی تازە بەسوودە بۆ ئێسکە نەرمە .

٣-زۆر جار بەکاردەهێنرێت لە دژی هەوکردن میزەڵدان.

٤-دەتوانیت لە ڕووی پێستت بەکاری بهێنیت یاخود لە حەمام.

٥- وێنجە ( سێپەڕە ) یارمەتیدەرە بۆ ماندوو بوون یاخود ئازار لە ماسوولکەکان.

٦- سێپەڕە بۆحەزکردن لە خۆراك ( ئارەزوو کردنی خۆراك ) بەکاردەهێنرێت چالاکە بۆ هەرس کردن سێپەڕە زۆر دەوڵەمەندە بە ڤیتامینەکان و کانزا و ئاسن و کالیسیۆم و

مەگنسیۆم و پۆتاسیۆم و ڤیتامین ((١٢)) .
٧-دیسان بەکاردەهێنرێت بۆ کەم کردنەوەی ئازار و ئیلتیهاب لە جومگەکان و بەشێك لە رۆماتیزم .
٨-یارمەتیدەرە لە دژی کەم خوێنی و هەوکردنی جومگە وە جێگیری رێژەی شەکر لە خوێندا و بەدەست هێنانی گونجاندن لە نێوان رژێنی نوخام و لابردنی ژەهراوی بوون لە خوێن و گورچیلە دا .
٩-بۆ هێورکردنەوەی قورحە و جگەر و چالاککەرەوەی دڵە .
١٠-یارمەتیدەرە بۆ لابردن و نەهێشتنی ژەهراوی بوون و ترش بون.
١١-یارمەتیدەرە لە بەرهەم هێنانی هۆرمۆنی ئەسترۆجین و کاردەکات لە دژی دڵ تێك هەلآتنی بەیانیان.
١٢- پێك هاتووە لە فلورایدی سروشتی و میز هێنەرە.
١٣- وێنجە ( سێپەرە )دەتوانرێت بەکاربهێنرێت لەکاتی تا لێهاتن و رۆماتیزم. کاریگەری سوك دەکاتە سەری.
١٤-یارمەتیدەرە دژی هەوکردنی میزڵدان یاخود میزڵدانیکی توش بوو بە هەوکردن و کەم کردنەوەی هەوکردن ، وە یارمەتیدەرە بۆ مانەوەی ئاو وە وا دادەنرێت کە وێنجە ( سێپەرە )ی ووشك چالاکە بۆ میزهێنان ، هەروەها بە نەرمی نیش دەکات بۆ چارەسەری نەخۆشی گورچیلە .
١٥- پێك هاتووە لە رێژەیەکی بەرز لە کلۆرۆفیل و کەرەستەی خۆراك بەخش ، وە یارمەتی دەدات بۆ رزگاربوون لە بۆنی ناخۆشی دەم .
١٦- وێنجە ( سێپەرە ) جەستە چالاك دەکات، بە تایبەتی جگەر ,دژی هەموو بەرهەڵستەکانی( کۆلێن )ە و کەمی خوێن و خوێن بەربوون و نەخۆشی شەکرە و قورحە و هەوکردنی ی جومگەیە
١٧-ئەرکی رژێنەری نوخامی دەپارێزێت
١٨- پێك هاتووە لە دژە نەخۆشی قارچکی و دژی ئۆکسیدە .
١٩-بەکارهێنانی وێنجە ( سێپەرە )بە سوودە ,ئەو کەسانە بەکاری دەهێنن کە دەنالێنن بە

دەست بەرزی ڕێژەی کۆلیسترۆڵ لە خوێن دا یاخود لە دەرمانی نەخۆشی شەکرە، وە بەکاردێت بۆ وەستانی خەست بوونەوەی خوێن، وە هەروەها وێنجە ( سێپەرە ) لەگەڵ مادەی یارمەتی دەر بەکاربهێنرێت چونکە تۆی فصە بەشێکی زۆر پۆتاسیۆمی تێدایە.

٢٠-دەتوانرێت سوود لە وێنجە ( سێپەرە )وەربگیرێت لە چارەسەری نەخۆشی گورچیلە و یارمەتیدەرە بۆ دەرچوون ( فرێدانی ) بەردی گورچیلە.

٢١- وێنجە ( سێپەرە ) گرنگیەکی زۆری هەیە سەبارەت بە نەخۆشی شەکرە، لەبەر ئەوەی ڕێژەی کۆلیسترۆڵ لە خوێندا دادەبەزێنێ بە شێوەیەکی سروشتی ، وە ڕێژەی شەکر لە خوێندا دەپارێزێت ئەوە دوپات کراوەتەوە کە وێنجە ( سێپەرە )یارمەتی نزم بوونەوەی کۆلیسترۆڵ دەدات.

٢٢- وێنجە ( سێپەرە )باشە بۆ بەهێزکردنی ئێسك لە بەدەوەردانی بە کالیسیۆم، یاخود جۆرێك لە چایی دروست کراو لە وێنجە ( سێپەرە ) بە باشی کاردەکات بۆ یارمەتی دانی ئەو خەڵکانەی کە دەناڵێنن بە دەست هەوکردنی جومگەکان.

٢٣- وێنجە ( سێپەرە ) دەتوانێت یارمەتی دەربێت لە گەڕانەوەی ڤیتامین ١٢ لە لەشدا.
وە گرنگە ئەگەر هەندێ دژە تەنی زیندەیی بەکارببرێت یاخود هەندێ دەرمانی ناسراو بە شێوەیەکی بەردەوام.

٢٤-کاتێك بابەتەکە پەیوەندی بە شێرپە نجەوە هەبوو ڕەنگە وێنجە ( سێپەرە ) وەکو چارەسەر بەکارببرێت, یارمەتی گەرم بوون دەدات وە دەرکردنی هەندێ مادەی دیاریکراو کە دەبنە هۆی شێرپە نجە لە جەستەدا.

٢٥-لە نەخۆشییەکانی دڵ، وا دادەنرێت کە شەربەتی وێنجە ( سێپەرە )چارەسەرێکی مەزنە بۆ کێشەکانی دڵ، وە گیرانی دەمارەکان ، کۆکردنەوەیەکی گەورە هەیە لە نێوان شەربەتی گێزەر و وێنجە ( سێپەرە )

، دەبێت ئاماژە بەوە بکەین کە شەربەتی وێنجە ( سێپەرە )بە تەنهاش بەهێزە.

٢٦-دادەنرێت کە ئاسن کانزایەکی زۆر گرنگە وە کەمی لە لەشدا دەبێتە هۆی کەم خوێنی و بورانەوە و هیلاکی ، دەگوترێت کە وێنجە ( سێپەرە ) ماددەیەکی دەوڵەمەندە بە ئاسن وە لە ١٪ لە پێداویستییەکانی ڕۆژانەمان پڕ دەکاتەوە لە ١٠٠ گرام لە خواردنی ڕۆژانەمان.

**پێکهاتەی وێنجە ( سێپەڕە ) لە ١٠٠ گرام:**

**کالسیۆم: ٣٢ ملگ**

**ئاسن: ١ ملگ**

**کیلۆ کالۆری: ٣٩ ملگ**

**سۆدیۆم: ٦ ملگ**

**ڤیتامین C: ٨ ملگ**

## بادەم



بادەم پۆلێن دەكرێت لەگەڵ بەرە یەك ناوكیەكان لە خێزانی prunoidea یە گوڵەكانی دەگۆڕێت بۆ جەستەیەكی سەوز كە خاوەنی تام و چێژێكی زۆرە. كاكڵەی بادەم خۆش و نەرم و شێ دارە بەڵام بەرگی سەوزەكەی لە دەرموە دەگۆڕێت لە دوای گەشەكردنی بۆ رەنگی قاوەیی دواتر بۆ پێستێكی پتە و پایم و دارین.

كاكڵەی گوێزیش نەرمە و ئەویش دوای گەشە كردنی دەگۆڕێت بۆ رەنگی قاوەیی.

بادەم كاریگەری ئیجابی زۆری لەسەر تەندروستیمان هەیە، وەكو سەلامەتی قژ، یاخود بەڕێوەبردنی ئاستی كۆلیسترۆڵ، كاریگەری بادەم لەسەر تەندروستی دەستەواژەیەكە بۆ كاریگەری ئیجابی.

سووده تەندروستییەكانی بادەم:

١-لە لای ئەو منداڵانەی كە ئەناڵێنن بە هۆی توانای هەڵنەگرتنی لاكتۆز، ئامۆژگاری دەكرێن بەوەی كە بادەمی كوتراو لەگەڵ ئاوی گەرم تێكەڵ بكرێت و بیخۆن لەگەڵ شیردا.

٢-رۆنی بادەم خاوەنی نەرم كەرەوەیە یارمەتی نەرم بوونی پاشەڕۆ دەدات هەروەها هەموو كێشەكانی كۆئەندامی هەرس چارەسەر دەكات.

٣-بادەم دەتوانێت كۆلیسترۆڵ كەم بكاتەوە دەتوانێت چەوریە تێر نەبووەكان لەناوبەرێت. دەتوانێت نزیكەی (٨-١٢) لە سەدا كۆلیسترۆڵ كەم بكاتەوە بۆ جێگیری ئاستی كۆلیسترۆڵ.

٤-چالاكە لە سووڕی خوێن، چونكە بادەم دەوڵەمەندە بە پۆتاسیۆم و سۆدیۆم وە ئەمانەش

لەو هۆکار و سەرچاوانەن کە دەبنە هۆی رێك خستنی پەستانی خوێن، هەروەها مەگنسیۆم لە بادەم دا رۆڵێکی پۆزەتیف دەبینێ لەسەر دەمارەکان و خوێن بەرو خوێن هێنەرەکان. یارمەتی دەرە بۆ باشتر کردنی دەرپەڕینی مادە خۆراکیەکان کە بە لەشماندا تێ دەپەڕن ، هەروەها کە لە ئاسن پێك هاتووە کە یارمەتی هەڵگرتنی ئۆکسجین دەدات بۆ هەموو بەشەکانی لەشمان و ئەندامەکانی.

٥-دروستی دڵ دەپارێزێت، بادەم بە بەکارهێنانی بەلایەکی کەمەوە ٪٥٠ لە مەترسییەکانی دڵ کەم دەکاتەوە. بادەم پێك هاتووە لە رێژەیەکی زۆر لە ڤیتامین E مەترسی توش بوون بە نەخۆشیەکانی دڵ کەم دەکاتەوە. هەروەها بادەم یارمەتی پرۆتین ( سی ) دەدات بە کارلێکردن ( CRP ) لە دژی هەوکردنی دەمارەکانی .

٦-بەهێزکردنی ئێسکەکان: بادەم سەرچاوەیەکی زۆر باشی کالسیۆمە. رێگرە لە پوکانەوەی ئێسکەکان وە یارمەتی دەرە بۆ بەهێزکردنی ئێسکەکان و ددان و ماسولکەکان. بەشێکی زۆر لە یەکەی خۆراکی تری تیادایە کە یارمەتی دەرە لە زیادەی ماددەکان لە ئێسکدا، هەروەها یارمەتی دەدات بۆ تازەکردنەوەی و رێك خستنی هەیکەلی ئێسکی.

٧- یارمەتی لە دەست دانی کێش/ بادەم پێك هاتووە لە ریشاڵی زۆر و پرۆتین ، ئەمیش جۆرێکی باش لە رۆن بەرهەم دەهێنێت کە یارمەتی دەدات بۆ ئارەزوو کردن بۆ خۆراك بادەم رژێمێکی خۆراکی باشە وە دواتر یارمەتیدەری لەشمانە بۆ کەم کردنەوەی کێش.

٨-باشە بۆ نەخۆشیەکانی شەکرە/ بادەم رێژەی شەکر لە خوێندا کەم دەکاتەوە، دوای خواردنی بادەم ئەو کاتە لەش بەشێکی زۆر لە رێژەی شەکر لە خوێندا بەرز ئەکاتەوە، بادەم سنورێك دادەنێ بۆ بەرزبوونەوەی شەکر لە خوێندا وە ئاستی ئەنسۆلین لە دوای خواردنەکان.

٩-رێگرە لە دروستکردنی بەردی زراو: ئەو کەسانەی کە رۆژانە ( ٥ ) دەنکە بادەم دەخۆن لە ٪٢٥ مەترسیان کەمترە لە دروست کردنی بەردی زراو. هەروەها رۆنی بادەم چەند تایبەتمەندییەکی هەیە بۆ نەرم کردنەوەی پاشە ڕۆ یاخود دژی گیرانە ( قەبز بوون ).




١٠-مەترسییەکانی توش بوون بە شێرپەنجە کەم دەکاتەوە ، بادەم ڕێژەیەکی بەرز لە رەگی سروشتی تیادایە ، هەروەها جوڵەی خۆراك لەناو گەدەدا ئاسان دەکات . کە ڕێگر دەبێت لە توش بوون بە شێرچە نجەی کۆڵۆن، سەرچاوەیەکی نایابی ڤیتامین E و کەرەستە کیمیاوی و رووەکیەکانی فلافونیدات کە رێگرە لە گەشەکردنی شێرپە نجەی مەمك. هەروەها سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی بورونە کە یارمەتی دەرە لە خۆپاراستن لە شێرپە نجەی پرۆستات.

١١-ڕۆنی بادەم بە تێکەڵ لەگەڵ ترێ ڕێگرە لە هەڵوەرینی قژ، وە رێگرە لە پیر بوون، هەروەها لە ناوەری کرێزی سەرە و یارمەتی دەری پێستە وەکو ماسك بۆ دەم و چاو بەکاردێت، کاتێك دەم و چاو ووشك بوو، وە رێگرە لە پەیدابوونی زیپکە وە سەرە رەشە ووردەکان کە بەدەم و چاوەوەیە تا ماوەیەکی زۆر کاریگەری خۆی دەهێڵێتەوە وە چارەسەرێکی باشە بۆ زیپکەی لاوی.

١٢-هەروەها پێستی لەش چاك دەکات وە پیربوونی پێشوەخت لەناو دەبات وە خۆراك دەدداتە پێست کە وای لێدەکات نەرم و جوان بێت.

١٣-بەهێزکردنی ووزەیە/ هەموو مادە خۆراکیەکان کە لە بادەم دا هەن وەکو/ پرۆتین و مس و مەنگەنیز و ڤیتامین کاردەکەن بۆ دروست کردنی ووزە لە لەشدا.

١٤-بادەم یارمەتی مێشك دەدات/ سەرچاوەیەکی هەرە زۆری رەگەزە خۆراکییەکانە کە یارمەتی پێشکەوتنی عەقڵ دەدات، خواردنی بادەم لە هەموو تانی بەیانیانیەك دا باشە .

یارمەتی دەرە بۆ بیرکەوتنەوە، وە یارمەتی خانەکانی مێشك دەدات.

١٥-سەرچاوەیەکی باشی پرۆتینە، بادەم باشترین سەرچاوەی پرۆتینە رووەکییەکانە .

چارەکێك کوپ ( نزیکەی ٣٠ بادەم ) پێك هاتووە لە ( ٦-٧ ) گرام لە پرۆتین.

بەکارهێنانی بادەم لە گشت وەرزەکادا دەبێ. بادەم خواردنێکی خۆش و شیرینە

بەڵام بادەمی تاك خواردنی لەگەڵ ڕۆنی بادەم دا دەبێت.

**شیری بادەم**

سوودە تەندروستییەکانی شیری بادەم :

١-یارمەتی گەشە دەدات ، کاریگەری لەسەر چالاکی و لێپرسراویەتی جەستەوە هەیە.

٢-مەنگەنیز کە لە شیری سۆیادا هەیە ئەنزیمەکان لە جەستەدا چالاك دەکات.

٣-مەگنسیۆم ئیش دەکات بۆ گۆڕینی خواردن بۆ ووزەی بەکارهێن، وە یارمەتی رژێنی دەرەقی دەدات بە شێوەیەکی دروست ، پاراستنی دروستی ئەندامەکان دەگریتە خۆ.

٤-پێك هاتووە لە ڤیتامین E کە دژی ژەهراوی بوونە، وە ئەو ڕەگە ئازادانە لەناو دەبات کە دەبنە هۆی زیان لە توێژاڵ ( بەرگی ) خانەکان.

٥-ڕەگەزی سیلینیۆم :کە کۆئەندامی زاوزێ باش دەکات کە بەشێوەیەکی دروست کار بکات .

٦- پۆتاسیۆم :یارمەتی دەرە لە پاراستنی پەستانی خوێنی سروشتی.

٧-لەبەر ئەوەی لە کۆلیسترۆڵ پێك نەهاتووە بەمەش مەترسی کەمتر هەیە لە تووش بوون بە نەخۆشیەکانی دڵ.

٨-ڤلافونیدات :بەرگی بادەمی زەوی باشە بۆ دروستی دڵ.

٩-بە سروشتی خۆی تامێکی سروشتیی هەیە پێویستی بە تامی دەستکرد نییە.

١٠-بە ئاسانی دروست دەکرێت و هەڵدەگیرێت .

١١-لە کاتی دروست کردنی شیری بادەم دا هیچ ڤیتامین و کانزایەك لە دەست ناچێت لەبەر ئەمەش زۆر گرنگ نییە کە لێ بنرێت .

١٢-وا دادەنرێت کە بەدیلێکی باشە بۆ ئەو کەسانەی کە توانای لاکتۆزیان نیە.

## قارچكی بادەم



قارچكی بادەم گەشەدەكات لە بەراری بەرازیل و ئەرجەنتین لە دۆخێكی ئیستیوائی ( مام ناوەند ) وە لەكاتی ئێستادا چاندنی لە هۆڵەندا ئە نجام دەدرێت .

قارچكی بادەم تامێكی خۆشی هەیە، بادەم پێك هاتووە لە ڤیتامینەكانی A،C، سۆدیۆم ، پۆتاسیۆم ، كالسیۆم، فۆسفۆر، مەگنسیۆم و ئاسن .

شێوەكانی قارچكی بادەم جۆراوجۆرە ، بۆ دا پۆشینی قارچكی بادەم پلەی جۆراوجۆری لە رەنگی قاوەیی هەیە وە قەدێكی سپی هەیە ، وە ئەستوری و درێژی جیاوازە لە قارچكی سپی، قارچكی بادەم كەمترە درێژییەكەی كاتێك پێ ئەگات قارچكی بادەم لە رێژەیەكی زۆر لە توخمی ووشك پێك هاتووە ، وە بەشێكی كەم شێ ومردەگرێت لەكاتی لێنان دا.

وە لێرەدا چەند بەشێكی دیاریكراو لە قارچكی بادەم هەیە ، قارچكی Agaricusblazei و Murill ناسراوە بە ناوی قارچكی بادەم یان Himemastutake, لە بەرازیل نهێنی گەشەكردنی ئاشكرا نییە هەتا ئێستا ، دارەكانی زیندوون ، بەڵام گەڵاكانی مردوون، قارچكی بادەم لەسەر تێكەڵاوی ( ئاوێتەكردنی ) لەگەڵ پەیینی ئەسپ و كاو و پوش و پاڵاش ئە نجام دەدرێت لەگەڵ پەیینی دەواجن كە دا پۆشراوە، وە وا دادەنرێت كە چاندنی قارچكی بادەم چاندنێكی خاوە، وە چاندنەكەی خاوەنی بەروبومی دیاریكراو ئە نجامی دەدات بە تەنها .

**سووده تەندروستییەکانی قارچکی بادەم:**

١-سەرما و ئەنفلۆنزا: هەرچەندە بەشێکی کەم لە ڤیتامین Cی تێدایە، بەڵام ئەنجامەکان دەریان خستوە کە رێگرە لە کۆکە و پیسایی لوت کەم دەکاتەوە.
٢-رێژەی کۆلیسترۆڵ لە خوێندا کەم دەکاتەوە هەروەها بەسەر کەوتوانە بەکاریان هێناوە بۆ هەندێ حاڵەتی هەوکردنی جگەر.
٣-لە قارچکی بادەم دا توخمی زۆر گرنگ هەیە وە رەگەزی زۆر بە سوودی تێدایە لە کالسیۆم یارمەتی قژ و نینۆکەکان دەدات و جوانتر و درەوشاوەتریان دەکات.
٤-یارمەتی بەرنگاربوونەوەی گوێزانەوە دەدات هەروەها خاوەنی ڤیتامین A یە کە توێژاڵی خانەکان بە ساغی دەهێڵێتەوە وە هەروەها وای لێدەکات زیاتر بە توانا بێت بۆ دەست گرتن بەسەر بوونەوەرە زیندوەکاندا کە دەبنە هۆی نەخۆشی.
٥- پێك هاتوە لە ڤیتامین C کە روخسارێکی جوان و تەندروستت دەداتێ.
٦-لە فۆسفۆر پێك هاتووە بەڵام ئایا بوونی فۆسفۆر چی دەبێت لە خۆراکمان؟ رۆڵێکی سەرەکی و گرنگ دەبینێ لە پێك هێنانی ئێسك و ددان هەروەها رۆڵێکی گرنگ دەبینێ لەشدا لە کاتی بەکارهێنانی کاربۆهیدرات و چەوری وە رێك خستنی پرۆتینی گەشە، چاککردنەوەی خانەکان، هەروەها بۆ بەرهەم هێنانی گەردی ATP کە لەش بۆ هەڵگرتنی وزە بەکاری دەهێنێت یارمەتی گرژبوونی ئێسك دەدات و پێك هێنانی شانە ماسولکەییەکان ، وە پاراستنی رژێمی لێدانی دڵ.
٧- ئاسن کانزایەکی گرنگە وە کەمیی دەبێتە هۆی کەم خوێنی و بوورانەوە و ماندوو بوون ، قارچی بادەم دەوڵەمەندە بە ئاسن ، لە کاتی خواردنی ((١٠٠ گرام)) لە رۆنی بادەم (١,٢) لە ئاسن مان دەست دەکەوێت.
٨-کۆئەندامی بەرگری باش دەکات وە بۆ چاککردنی لەوزەتێن.
٩-قارچك بەکاردەهێنرێت لە بواری دروست کردنی دەرمان بە هۆی کاریگەری باشی لەسەر کەم و کورتییەکانی لاشەیی و دەست گرتن بەسەر کۆلیسترۆڵ و شەکر لە خوێندا.
١٠- پێك هاتووە لە رێژەیەکی زۆر بەرز لە بیتاکلوکان.

١١-بە هۆی چالاکیەکەیەوە بەکاردەهێنرێت دژی کیسکردن ( ئاوسان ) لە چارەسەرکردنی شێر پە نجەدا بەکاردێت.

١٢- کردارێکی باشی تیایە لەسەر ئۆرگانەکانی لەشی مرۆڤ وە لە ناوبردنی بەکتریاکان.




دەزگای لەناوبردنی میکرۆبەکان

١٣-هەروەها توانای رێك خستنی ئاستی گلوکۆزی لە خوێندا هەیە لەبەر ئەوەی ئاستی ا دیونیکیتین لە لەشدا زیاد دەکات.

پێکهاتەی قارچکی بادەم لە ١٠٠ گرام:

| | |
|---|---|
| کالسیۆم: ٨ ملگ | بەکولاّوی:٤ ملگ |
| فۆسفۆر: ١٢٥ ملگ | بەکولاّوی:٥٣ ملگ |
| ئاسن: ١,٢ ملگ | بەکولاّوی:٥٣ ملگ |
| پۆتاسیۆم: ٤٢٥ ملگ | بەکولاّوی:٤١٠ ملگ |
| کیلۆ کالۆری: ١٢ | بەکولاّوی:٥٣ |
| مەگنیسیۆم: ١١ ملگ | بەکولاّوی:١٢ ملگ |
| سۆدیۆم: ٨ ملگ | بەکولاّوی:٢٧٠ ملگ |
| A ڤیتامین: و,٠ ملگ | بەکولاّوی:١,٥ ملگ |
| C ڤیتامین: ٤,٩ ملگ | بەکولاّوی:١,٥ ملگ |

## خەردەل ( خەرتەلە )کاهو



خەرتەل رووەکێکی گیاییە ، بەرزییەکەی دەگاتە نزیکەی مەترێك وە لق و پۆپی زۆری لێ دەبێتەوەو بەتاییەت لەچڵەکانی ئەمەش لە نوکی خەرتەلەکەدا، گەڵاکانی سادەو بەرانبەر یەکترن. خاوەنی گوڵی زەردە و بەشێوەی هێشو یاخود میوە کە شێوەی لولەکی و تۆپیین و ڕەنگی زەردی قاوەییە، پێك هاتون لە بەرێکی تۆپی کە شێوە و قەبارە پچوکن. خەرتەلە لە سەردەمانێکی کۆنەوە دۆزراوەتەوە . وە ڕۆمانیەکان بەکاریان هێناوە بۆ تەرکردنەوەی زەڵاتەی تون. توێژینەوەکان دەریان خستووە کە زۆرجار گرنگی هەیە لە دژی نەخۆشیەکانی شێرپەنجە.

سوودە تەندروستییەکانی خەردەل ( خەرتەلە ):

١-خەرتەلە پێك هاتووە لە کانزا و ڕەگەزی گرنگ وەکو کالیسیۆم کە بەسوودە بۆ قژ و نینۆك بە شێوەیەکی تەندروست دەیانپارێزێت.

٢-ئاسن کانزایەکی زۆر گرنگە، وە کەمی دەبێتە هۆی کەم خوێنیو بورانەوە و ماندوو بوون، خەرتەلە دەوڵەمەندە بە ئاسن بەکارهێنانی ١٠٠ گرام لە ڕۆژێکدا ڕێژەی ١,٤ ٪ ئاسنی تێدایە.

٣-خەرتەلە پێك هاتووە لە ڤیتامین C کە پێست دەپارێزێت وە دەرکەوتووە کە دەبێتە هۆی لەناوبردنی کۆکە و نەهێشتنی پیسایی لوت.

پێکهاتەی خەردەل ( خەرتەلە ) لە ١٠٠ گرام:

| | |
|---|---|
| کالسیۆم: ١٥٠ ملگ | کیلۆ کالۆری: ٢٨ ملگ |
| ئاسن: ١,٤ ملگ | C ڤیتامین: ١٥ ملگ |
| پۆتاسیۆم: ٣٠٠ ملگ | |

## ئەنەناس



ئەنەناس خاوەنی تام و چێژێکی خۆشە و شێوەیەکی درەوشاوەیی هەیە و بەهێزە ، وە دەورە دراوە بە تاج لەسەرەوە ، ئەنەناسی پێگەیشتوو گونجاوە بۆ بەکارهێنان.

ئەنەناسی پێ گەیشتوو لە دەوڵەتانی وەکو ( ساحل العاج و بەرازیل و ئەمریکای ناوەراست ) هەیە پوختەی ئەنەناس یارمەتیدەرە بۆ چارەسەری پرۆتینەکان و یارمەتی لەناوبردن و دژی ( هەوکردنە ) وە ئەمەش رێگرە لە دروست بوونی جەڵتەی خوێن. وە هەوکردنی جومگەکان کەم دەکاتەوە ، خەرتەلە لە کۆمەڵێکی زۆر لە ریشاڵ کە گونجاوە بۆ توانەوە ، رۆنی ئەنەناس وەکو شەربەتێ بۆ مەساج کردن بەکاردێت یاخود بۆ شێلان بە کاردێت. ئەو خەڵکانەش دەتوانن بەکاری بهێنن کە دەناڵێنن بەدەست بەردی گورچیلەوە وە باشترە شەربەتی ئەنەناس بخۆنەوە بە شێوەیەکی رێك و پێك.

وە بۆ ئەو کەسانەش بەسوودە کە ماوەیەکی دوور و درێژ کاردەکەن ، وە ئەنەناس یارمەتی ئەو کەسانە دەدات کە رووبەروی ئەکزیما دەبنەوە ، ئەنەناس پێك هاتووە لە رەگەزی گرنگ وە هەروەها مەنگەنیز کە ئێسك دەپارێزێت و بەهێزی دەکات و خاوەنی ڤیتامین C ی دژە ئۆکسیدە ، سەرچاوەیەکی باشە بۆ ڤیتامینەکانی $B_1$ ، $B_6$ و مس و ریشاڵە خۆراکییەکان .

**سوودە تەندروستییەکانی ئەنەناس:**

**١-بەسوودە بۆ ئەو کەسانەی توشی هەوکردنی جیوب بوون وە ڕیچکەی هەوای بەکاربردنی ڕێك و پێکی ئەنەناس پیسای لوت لەناو دەبات لە کونەندامی لوت و جیوب و هەناسە و هەوکردنی.**

**٢-بۆ بەهێزکردنی ئێسکەکان/ لەبەر ئەوەی مەنگەنیزی تیادایە ئەمەش گرنگە بۆ لەش و ئێسك وە بونیات نانی ڕیشاڵەی الفام؟؟**

**٣-جەڵتەکانی خوێن / پوخت کراوەکانی ئەو خواردنانەی** کە لە ئەنەناسدا هەن **مەترسیەکانی جەڵتەی خوێن کەم دەکەنەوە هەروەها** یارمەتی کێشەکانی دڵ دەدەن.

**٤-هەرس کردن/ پۆختەکراوەکانی** دیسان یارمەتی کرداری هەرس کردن دەدەن تەنانەت **کەرتێك** ئەنەناس دوای خواردن ، ئاوسان و گیربوون وە نیشانەکانی کوڵۆن دەماری و غازات **و دڵ تێك هە**ڵاتن لە ناو دەبات.

**وە ئەنەناس سودێکی** زۆری هەیە لەلایەنی تەندروستیەوە یارمەتیدەرە لە ڕزگاربوون لە **ماندوو بوون.**

**٥-سەرما و ئەنفلۆنزا / لە جیاتی خواردنەوەی شەربەتی پرتەقاڵ یان تەواوکەرەکانی ڤیتامین C هەوڵبدە شەربەتی ئەنەناس بخۆیتەوە خاوەنی نزیکەی هەمان ڕێژەی ڤیتامین Cیە ، بەڵام دەرکەوتووە کە کۆکە لە ناودەبات وە دەبێتە هۆی دەردانی پیسای لوت.**

**٦-هەوکردنی جومگەکان/ کوپێك لە شەربەتی ئەنەناسی تازە هەموو ڕۆژێك یارمەتی کەم کردنەوەی ئازاری جومگەکان دەدات.**

**٧-چاوەکان/ دواهەمین سوودی گەورەی ئەنەناس بۆ تەندروستی ڕێژەی زۆری بیتاکاروتینە - دژە ئۆکسیدە کە ئەمەش باشە بۆ تەندروستی چاو، لەوانەیە بەکاربردنی ڕێکو پێکی شەربەتی ئەنەناس یارمەتی ڕێگەگرتن لە لەدەست دانی چاوەکان بدات.**

**چاوێك بخشێنە بە سوودەکانی شەربەتی گێزەر ئەگەر دەتەوێت زیاتر لە سەرچاوەکان بزانیت.**

**٨-تەندروستی پوك زۆر گرنگە/ ئەنەناس یارمەتی ئەم بوارەش دەدات وە سنورێك دادەنێ**

بۆ هەوکردنی پوك.

٩-الاصلاح الانسجه : نەنزیمەکان لە ئەنەناسدا بەکاردێت بۆ چارەسەری نەشتەرگەری هەوکردنی جومگەکان ، ڕۆماتیدی بۆ چاککردنی گونجاندن ئەمەش لە ئەنجامی پێکانەکان.

١٠-جەڵتەی خوێن/ تاقیکردنەوە شاراوەکان ( سرییەکان ) دەریان خستووە لەو نەخۆشانەی کە بە دەستی ناتەواوی دڵیانەوە دەناڵێنن جەڵتەی خوێن لەناو دەبات.

برۆملین لەناو دەبات کە دەبێتە هۆی جەڵتەی دڵ.

١١-خۆراکی مێشکە/ ئەنەناس بە سوودە بۆ عەقڵ ، وە باشە بۆ پاراستن لە نەخۆشیەکانی لەدەست دانی زاکیرە و دڵ تەنگی و خەمۆکی.

پێکهاتەی ئەنەناس لە ١٠٠ گرام:

کالسیۆم: ١٢ ملگ

کیلۆ کالۆری: ٥٠ ملگ

سۆدیۆم: ٤ ملگ

C ڤیتامین: ٢٥ ملگ

مادە ڕیشاڵیەکان: ١,٢ غرام

## کاهوو الهندباێ



تاڵیشك کاستی _کاستی بە خێرایی دەروێت و گەشە دەکات بە پشت بەستن بە پلەی گەرمی سروشتی گەشە دەکات لە کۆتایی مانگی ( یەك ) وە لە وەرزی بەهاردا زۆر کات دەروێت لە ماوەی ( ٨ ) هەفتەدا، دەتوانرێت کاستی بروێنرێت لەسەرەتاکانی مانگی بەهاردا لە ژێر خاوی پلاستیکیە ساردەکان. بەڵام زۆر جار تەنك و درێژن، لەبەر ئەوەی ڕۆژەکان زۆر کورتن وە ناو خانوە پلاستیکەکان زۆر تاریك و فێنکن. هەرچەندە تۆوەکان گەشەبکەن و بڕوێن بۆ ماوەیەکی درێژتر باشترە، بەڵام تۆوەکان بەکاردەهێنرێن بۆ دەرمانی کۆلیسترۆڵ ، چەوریەکان ، تاوزەی گەرمی وە سودی بۆ جگەر هەیە، وە بەکاردەهێنرێت بۆ هەوکردن و ئاوسان، هەروەها ئاماژە بەوە دەکرێت کە ڕەگی هندباو بەکاردەهێنرێت بۆ هێورکردنەوە، هەروەها ڤیتامین K, C, E, A, تێدایە، گرنگیەکی زۆری تیادایە بە هۆی ئەم ڤیتامین و ماددانەوە.

وە هندباو کۆمەڵێك لە کاربۆهیدرات بەرهەم ئەهێنێ ئەوانەی کە بەکتریا وەك خۆراك بە کاردەهێنن لە کەناڵی هەزم کردنەوە. یارمەتی لەش دەدات بۆ ڕێگری کردن لە شێرپەنجەی کۆڵۆن، وە کالسیۆم و مەگنسیۆم لە لەشدا زیاد دەکات، کە لەوانەیە بتوانرێت لە خواردنێکی دیکەوە بمژرێت، هەروەها یارمەتی بونیادنانی ئێسك دەدات.

سووده تەندروستییەکانی کاهوو الهندباێ:

١-بۆ چارەسەری شێرپەنجە/ وا دادەنرێت کە هندباو سەرچاوەیەکی نایابی ڤیتامین A یە، وادەکات کە خۆپاراستن لە شێرپەنجە ئەگەری هەبێت ( بە تایبەتی لە شوێنە راستەوخۆکان و میزڵدان )

٢-بۆ چارەسەر کردنی کەم خوێنی ، شەربەتی هندباو لەگەڵ کەرەوز و مەعدەنوسدا چارەسەرێکی باشن بۆ ئەو کەسانەی کە کەم خوێنیان هەیە، وە ئەم تێکەڵانەش وەکو

بەهێزکەری خوێن کاردەکەن.

٣-لەبەر ئەوەی تاووزەی نزمی تێدایە خواردنێکی باشی لێ دروست دەبێ شەربەتی هندبای خاو یان خواردنی بەرەکەی یارمەتی زۆر لە دەست دانی کێش دەدات.

٤-بۆ چارەسەری تەنگەنەفەسی/ شەربەتی هندبائ تێکەڵ لەگەڵ گێزەر و کەرەوز وا دادەنرێت باشترین یارمەتی دەر بێت بۆ نۆرەکانی تەنگەنەفەسی .

٥-چارەسەری قەبزی (گیربوون) دەکات/ رەگەزەکانی خۆراك گرنگن، وە ڕیشاڵەکان لە زەڵاتەی سەوزە سەوزەواتەکان یارمەتی کەم کردنەوەی گیر بوون( قەبزی) دەدەن ، ئەمەش لەگەڵ تێکەڵەی سێو وشەربەتی گێزەر.

٦-کێشەکانی چاو/ یارمەتی کێشەکانی چاو دەدات وەك ( تاریك بوونی گلێنەی چاو ، کوێری الصفور البقعی وە هتد )

شەربەتی هندبائ شەربەتێکی کاریگەرە کە کاریگەرییەکی ئیجابی هەیە لە کاتی تێکەڵ کردنی لەگەڵ گێزەر و مەعدەنوسدا و کەرەوزدا، وە شەربەتی سپێناغ، خواردنی نزیکەی ١٨٠ ملم واتە (٦کوپ) لەم شەربەتە تێکەڵە بەرێك و پێکی باش بونێك دەبینین لە ماوەی چەند مانگێکی کەمدا

پێکهاتەی کاهوو لە ١٠٠ گرام:

.کالسیۆم: ٦٠ ملگ

فۆسفۆر: ٧٠ ملگ

کیلۆ کالۆری: ١٠ ملگ

پۆتاسیۆم: ٣٠٠ ملگ

سۆدیۆم: ٢٥ ملگ

## سێو



کاتێك کە لە ژێر دارێکی سێو دا دادەنیشی، سەیری مێروولەیەك دەکەی دروات بەرەو ماڵەکەی چێژ لە دیمەنی جیاکانی وەردەگرێت ، هەموو ئەو ماندووبونانە لە بیردەکەی لە کاتی نیش کردندا ، ئەمە سەبارەت بە داری سێو، بەڵام بەرهەمەکەی ( بەر ) سەرچاوەی تامێکی خۆش و چارەسەری کۆمەڵێك نەخۆشییە ئەو کەسانەی کە دەگەڕێن بە دوای چارەسەرکردنی کێشەی قەڵەوی ئەوا سێو باشترین نمونەیە بۆ چارەسەرکردن.

سێو پێك هاتووە لە (٦٠) تا وزەی گەرمی بەڵام لەمانەش گرنگتر پێك هاتووە لە کۆمەڵێك لە شەکرە بە سوودەکان بە تایبەت شەکری ( فرەکتۆز ) و ڕیشاڵەکان، ئەمە واتە ڕێگری کردن لە تووش بوون بۆ پێك هێنانی چەوری لە لەش دا.

چونکە ڕیشاڵەکان ڕێگرن لە سەرهەڵدانی چەوری , خواردنی زۆری سێو لایەنی خراپ بە دوای خۆیدا دەهێنێ، توێژینەوەکان دەریان خستووە کە خواردنی سێو بە شێوەی لە ڕادەبەدەر نەبێتە هۆی گەرکەوتنی چەوری لە لەشدا بەڵام خواردنی بە شێوەی ڕێك و پێك کاریگەری پێچەوانە دەبێتەوە، پێش هەموو ژەمێکی خواردن سێوێك بخۆ یارمەتیدەرە بۆ کەمتر خواردن لە کاتی نان خواردن.

وتراوە ئەگەر (٣) سێو بخۆی لە ماوەی یەك ڕۆژ کەمە، بەڵام سوودو کاریگەری زۆری هەیە دواتر دروستی سییەکان دەپارێزێت , خواردنی سێو لە هۆڵەندا زۆر بەر بڵاوە.

سووده تەندروستییەکانی سێو:

١-بۆ چارەسەری ئەنیما ، سێو بەسوودە بۆ چارەسەرکردنی کەم خوێنی ، کەم خوێنی واتە کەمییە لە هیمۆگلۆبین لە خوێندا بەمەش دەتوانیت خوێن زیاد بکەیت لە کاتی خواردنی

خواردەمەنیەك كە دەوڵەمەندە بە ئاسانی وەكو سێو.

٢-دەرکەوتووە کە سێو یارمەتی بەرەنگاربونەوەی نەخۆشی داخورانی ئێسك دەدات ، وە بە زیادکردنی خواردنی سێو ، ئێسك زیاتر بەهێز دەبێت وە لێرەدا رەگەزێکی دیکە لە سێودا هەیە ئەویش ( بورون ) ە، کە ئێسکەکان بەهێز دەکات.

٣-چارەسەری تەنگەنەفەسی دەکات. ؛ ڕۆژانە شەربەتی سێو بخۆرەوە یارمەتی دەرە بۆ لەناو چوونی تەنگەنەفەسی.

٤-لەناوبردنی زهایمەر: ماددەی کریستینی تێدایە ، خانەکانی مێشك دەپارێزێت لە تووش بوون بە زەهایمەر.

٥-مەترسیەکانی نەخۆشی دڵ کەم دەکاتەوە وە ڕێژەی کۆلیسترۆلی بەرز دادەبەزێنێ. وە بوونی مادەی ( بەکتین ) لە سێودا LDL ی کۆلیسترۆڵ کەم دەکاتەوە ، ئەو کەسانەی کە ڕۆژانە دوو سێو دەخۆن یارمەتیان دەدات بۆ کەم کردنەوەی کۆلیسترۆڵ ، ئەمەش زۆر بەسوودە بۆ دڵ ,نزیکەی ١٦ لەسەدی کۆلیسترۆڵ کەم دەکاتەوە.

٦-شێرپەنجەی سی/ یارمەتیدەرە بۆ کەم کردنەوەی ڕێژەی مەترسی توش بوون بە شێرچە نجەی ( سی یەکان ) نزیکەی ٪٥٠ لە مەترسی کەم دەکاتەوە ، وە ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئاستی بەرزی فلامونویو کە تیایدا هەیە.

٧- پاراستن لە شێرپەنجەی مەمك/ دەتوانیت سێو بخۆیت بۆ یارمەتی دان لە بەرگریکردن لە توش بوون بە شێرپەنجەی مەمك.

٨- پاراستن لە شێرپەنجە. بە بەکارهێنانی توێکڵی سێو دەتپارێزێت لە تووش بوون بە نەخۆشی کۆڵۆن ، ئەمەش بەهۆی بوونی ( بەکتین ) لە سێودا، وە هەروەها ڕۆڵێکی پۆزەتیف دەگێڕێت لەسەر کۆئەندامی هەرسدا.

٩-ڕێگری کردن لە شێرپەنجەی جگەر/ خواردنی سێو لەگەڵ توێکڵەکەی ٪٥٧ لە مەترسیەکانی تووش بوون بە شێرپەنجەی جگەر کەم دەکاتەوە.

١٠-بەرهەڵستی دژی نەخۆشی شەکرە/ بونی مادەی بەکتین لە سێودا دادەنرێت بەو مادەیەی کە لەش پێویستی پێیەتی بۆ بەرهەڵستی کردن بۆ ڕێژەی ئەنسۆلین لە جەستەدا و کەم کردنەوەی وە یارمەتی چارەسەرکردنی نەخۆشی شەکرە دەدات.

**١١- لاوازی و بێ هێزی/ دەزانین کە سێو باشە بۆ وازهێنان لە لاوازی و بێ هێـزی زینـدەیی و گەشە دەبەخشێتە لەشمان.**

**ئامۆژگاری:**

**وە یارمەتی نەخۆش دەدات بۆ هەرچی زووتر چاك بوونەوەی لە نەخۆشییەکەی ئەگەر تۆ دەتەوێت کێشی زۆرت کەم بکەیتەوە ڕۆژانە سێو بخۆ، هەروەها یارمەتی لەناوبردنی ژەهراوی بوون دەدات لە لەشدا وە باشترکردنی تەندروستی.**
**سێو باشە بۆ جەستەت ، بەڵام باش نیە هەموو کات بۆ ددان ، بۆیە پێویستە لەسەرمان دوای خواردنی سێو ئاو بخۆینەوە.**
**پێکهاتەی سێو لە ١٠٠ گرام:**

| | |
|---|---|
| **کالسیۆم:** | **٤ ملگ** |
| **فۆسفۆر:** | **١٠ ملگ** |
| **کیلۆ کالۆری:** | **٤٨ ملگ** |
| **پۆتاسیۆم:** | **١٢٠ ملگ** |
| **سۆدیۆم:** | **٢ ملگ** |
| **ڤیتامین C:** | **١٠ ملگ** |

**هلیۆن**



بناغـەی کـەنگر لـە ناوچـەکانی ڕۆژئاوایـەوە دورگـەی دەریـای سـپی ناوەڕاسـت، کـەنگر دۆزرایـەوە لـە کێڵگەکانی ڕۆمانیـا، نزیکـەی زیـاتر لـە ٢٠٠٠ ساڵ پێش ئێستا ، کەنگر گەیشتە انگلترا لـە سـاڵی ١٥٤٨ فەرەنسیەکان لـە ( لویزیانـا ) کـەنگریان چـاند لـە نیـوەی سـەدەی نۆزدەهـەم دا. وا دادەنرێـت کـە ئێستا کالیفۆرنیا مەڵبەندی دروست کردنی کەنگربێت، وەرزی کەنگر مانگی ( ٣ و ٤ و ٥ ) یـە ، کەنگر بەشێکی زۆر لە ڕیشاڵ و پۆتاسیۆم و کالسیۆم و فۆسفۆر و ئاسن وە ڕەگـەزی گرنگـی دیکەی تێدایە. بۆ ڕێك خستنی هاوسـەنگی یارمـەتی کردارەکـانی جگـەر دەدات ، هـەروەها یارمەتی دابەزینی کۆلیسترۆڵ دەدات لە خوێندا، وە یارمەتی ڕەپ بوونی خوێنبەر و جومگە ژان دەدات، یارمـەتی چارەسـەری هـەوکردنی جگـەر دەدات، وە زەردووی چـاك دەکـات، وە کاریگەری ئیجابی هەیە لەسەر ڕێژەکانی شەکر لە خوێندا ، وە ئارەزووی خـواردن و هـەرس کـردن بـاش دەکـات، ژانـە سـك و ئاوسـان و خـۆگرتن لـە خـواردن و دڵ تێـك هـەڵاتن و هەڵاوسانی سك باش دەکات ، کەنگر هەروەها پـاڵ دەنێت بـە زەردووی زراو لـە جگـەردا وە لەوانەشە یارمـەتی هەنـدێك لـە جۆرەکـانی سەرئێـشەی نیـوەیی بـدات وە بـە تایبـەتی ئەوانەی کە بەهۆی ژەهراوی بون لە خوێنەوە ڕوودەدات، یارمەتی لەش دەدات بۆ ڕزگـاربوون لە هەندێك ئاوی زیادە، دێوکیفیس ی لەش ، وە پێست بـاش دەکـات، زۆر جـار ئامۆژگـاری دەکرێت بەوەی کە بەشی ئاوەوەی کەنگر بەکاربهێنرێت بۆ دەرکردنی بەرد لە زراو، وە باشـە بۆ نەخۆشیەکانی جگەر، لەوانەیـە بەشـی ئـاوەوەی کـەنگر بپارێزرێت بـە ئاسـانی لـەناو شوشەکانی ڕۆندا، و بەکاردەهێنرێت بە شێوازی ئیتالی لە ڕێگەی کوڵانی کەرتی کەنگرەکە بە تەواوەتی ئینجا لێکردنەوەی پەڕەکانی، دواتر بخرێتە نـاو کـەرەوە و ساسـی کەرەکـەو

کەرەی تواوە یاخود سیر یان سەری سیری کوڵاو و مەعدەنوسی وردکراو لەگەڵ پەنیری پارمیزانی هاڕاو لەگەڵ وردە نان و زەیتی زەیتون پاشان دەکریت بکریتە ناو فرنەوە.

سوودە تەندروستییەکانی هلیۆن:

١-هەرس کردن/ لە گرنگترین سوودەکانی کەنگر رۆڵێکی گرنگی هەیە لە یارمەتیدانی کۆئەندامی هەرسدا بە تایبەتی لەگەڵ رووەکە سەوزەکانی دیکەدا وکو/ مەعدەنوس ، وە زۆرجار لە رابردوودا کەنگریان بەکارهێناوە بۆ هێورکردنەوەی گەدە. زۆرکات کەنگر بەکاردێت وەکو چارەسەری کۆڵۆن ی دەماری ( LBS ) لە هۆکارەکانی بەکاربردنی کەنگر لە کرداری هەرس دا ئەوەیە کە یارمەتی جوڵانی تورەکەی زراو دەدات دەوڵەمەندە بە دژە ئۆکسید، کەنگر لە هەمووی زیاتر ماددەی دژە ئۆکسیدی هەیە. بەهێزترین دژە ئۆکسید لە کەنگر دا بریتییە لە کوریستیت، و روتین، ئەنسۆسیانین، سینارین، تیولین ، سیلیمارین.

٢- پاراستن لە شێرپەجە/ لە کەنگر دۆزراوەتەوە لە ناو گەڵاکەیدا کە ئەرکی لەناوبردنی خانەی شێرپەنجەیە وە زۆرێك لە بەرزبوونەوەی لە توش بونی خانەکان بە شێرپەنجە جۆراوجۆرەکان.

وەکو لە شێرپەنجەی پرۆستات و خوێن و مەمك وە دادەنرێت کە رژێمی خۆراکی دەوڵەمەندە بە فلافید کە مەترسییەکانی تووش بوون بە شێرپەنجەی مەمك کەم دەکاتەوە.

٣-زیادەی دەردانی زەرداو/ گەڵاکانی کەنگر خاوەنی دژە ئۆکسیدن بولیفینول، وە ناو دەبرێت بە سینارین کە ئەویش دەردانی زەرداو زیاد دەکات.

٤-باشە بۆ جگەر/ بە هۆی سینارین دژە ئۆکسیدەوە کەنگر زۆر بە سوودە بۆ جگەر بۆ ئەوەی سەر لەنوێ جگەر رێك بخاتەوە بە بەکارهێنانی کەنگر ماوەیەکی زۆرە لە زانستی پزیشکیدا چارەسەرە لە بری چارەسەری نەخۆشیەکانی جگەر

٥-دەست دەگرێت بەسەر شوێنەوار( پاشماوە ) ی دەرمان دا ئەوی بە هۆی کاریگەرییە ئیجابییەکانی لەسەر جگەر ، زۆر خەڵك کەنگر بەکاردەهێنن وەکو چارەسەرێکی دژە پاشماوەی دەرمانەکان.

٦-دابەزینی کۆلیسترۆڵ: دوپات کراوەتەوە کە پێك هاتەکان لە گەڵاکانی کەنگر دا باشە

بۆ دابەزاندنی کۆلیسترۆڵ ( HMG ) ئەو کۆلیسترۆلی باش زیاد دەکات ( HDL ) وە ڕێـژەی کۆلیسترۆلی خراپ کەم دەکاتەوە.

٧-ڕیشاڵەکان / کەنگر پێك هاتووە لە بەشێکی زۆر لـە ڕیشاڵە زیـاتر لـە یـەك کـوپ لـە قۆخ.

٨-ڕێژەی شەکر لە خوێنـدا/ کـەنگر یارمەتیـدەرە بـۆ قەرەبووکردنـەوەی ڕێـژەی شـەکر لـە خوێنـدا ، وە یارمـەتی دەرە لـە پارێزگـاری کـردن لـە هاوسـەنگی ڕێـژەی شـەکر لای ئـەو کەسانەی کە دەناڵێنن بەدەست نەخۆشی شەکرەوە.

نیشی کەنگر پەیوەندی هەیە زۆرجار لەگەڵ ئەو کەسانەی کە ڕێژەی شـەکر لـە خوێنیانـدا هاوسەنگ نییە.

پێکهاتەی هلیۆن لە ١٠٠ گرام:

ئاسن: ١,٥ ملگ

پۆتاسیۆم: ٣٥٣ ملگ

کیلۆ کالۆری: ٤٦ ملگ

## کنگر





کاریگـەری ( چـاوماره – گیـا کـولنگ- کرچـەك- گیامـاران- کەڤـەر ) تـەنها تامەکـەی یـاخود بـۆنی کرچەك بەسە بۆ بەکارهێنان بەڵام دەبێ بزانین چی تری تێدایە، کە کاری باش دەکاتە سەر تەندروستی و زۆر دڵخۆشکەرە ، کرچەك ( چاوماره ) یەکێکە لە دەوڵەمەنـدترین سەرچـاوەکانی پـرۆتین، لەگـەل ڤیتامین C دا شان بە شان کاردەکاتـە سەر یارمەتی دانـی زیـادکردنی ووزە و پاراسـتنی جەسـتە دژی هـەوکرن، چـاوماره سەرچـاوەی ئاسـنە یارمـەتی کۆئەنـدامی بـەرگری دەدات و رێگـرە لـە کـەم خـوێنی. چـاوماره دەوڵەمەنـدە بـە ریـشالێ کـە گونجـاوە بـۆ توانـەوە ، کـە پارێزگـاری دەکـات لـە دژی زۆر لـە نەخۆشییەکان ، وە ئەم رەنگانەی چاوماره لە دوای کوڵانی لەگەڵ شیردا بەکاردەهێنرێت ، هێورکەرەوەیە یاخود بۆ کەم کردنـەوەی پاشماوەی دەرمان، وە خـۆراکێکی نایابـە، بـۆ باشتر کردنی دڵ دەتوانرێت وەك دەرمان بەکاربهێنرێت بۆ بێ هێزی دڵ یان گەورەبوونی، ئەمەش لە رێگەی تێکەڵـەی شـەربەتی تـازە لەسەوزەوات لەگـەڵ هـەنگوین و بـەکارهێنانی کەوچکێکی بچوك ٣ ژەم لە رۆژێکدا بەسوودە بۆ ئەو کەسانەی کە دەناڵێنن بەدەست نەخۆشیەکانی دڵەوە.

ئەمەش لەگەڵ خواردنی سەوزەواتی لێنراو و زۆر باشە بۆ پێست و نینـۆك و قـژ، وە لێرەدا (( چاوماره‌ی کەرکەدی )) هەیە . چـاوماره‌ی کەرکـەدی: رووەکێکـە لـە بنەرەتـدا لـە سینیگال و غینیا دا هەیە کە شەربەتی بە تامی لێ دروست دەکرێت کـە زۆر جیاوازیـان نییـە، تـەنها لـە شێوەدا جیاوازیان هەیە لەگەڵ چاوماره‌ی ئاسایی.

سووده تـەندروستییەکانی کەنگر:

١-یارمەتی گـرژ بوونـەکانی سك پـری وە کیشەکانی دەدات . باشـە بـۆ کۆئەنـدامی هـەرس و کۆڵۆن.

٠-ڕۆڵێکی ئیجابی دەگێڕێت لە خەمۆکی

٠-یارمەتیدەرە لە زۆرتر کردنی ڕێژەی سەرکەوتن بە بەکارهێنانی چارەسەری کیمیاوی

٤-دادەنرێت کە میز هێنەرە وە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە باشە بۆ دژی هەوکردن و باشترینە دژی هەوکردنی جومگە و تەنگە نەفەسی و ڕۆماتیزم.

٥-یارمەتی دەدات بۆ ڕزگاربوون لە بلور

٦-دژی ژەهراوی بونی جەستەیە

٧-بە زیادکردنی کۆمەڵێك لە چاوەرە بۆ ڕژێمی خۆراك، کولیسترۆڵ کەم دەبێتەوە

٨-ڕۆڵێکی گەورە دەگێڕێت لای ئەو دایکانەی کە شیر دەدەن ، چونکە بەرهەم هێنانی شیر زیاد دەکات.

٩-دژە ئۆکسیدە کە دەبێتە هۆی زوو پیربوون

١٠-یارمەتیدەرە لە ڕێگری کردن لە ڕەق بوونی خوێنبەرەکان

١١-دژە قارچکە( کەڕووە )، دژی ڤایرۆسەکانە

١٢-گرنگی زۆری هەیە بۆ گورچیلەکان و لەش پاك دەکاتەوە لە کاتی دەرچوونی میزدا، وە ئەمانی بەردەکانی گورچیلە

١٣-دژی هەوکردنی میزڵدان و گیرانی میزە

١٤-دەتوانین وەکو چالاککەرەوەی جنسی بەکاری بهێنین یاخود زیادکردنی مەیلی جنسی.

١٥-یارمەتی لەناوبردنی ڤایرۆس دەدات کە دەبێتە هۆی کەمی بەرگری مرۆیی.

١٦-یارمەتی دەرە دژی نەخۆشی الاسقربوگ ,دژی شێرپەنجەیە بە تایبەتی شێرپەنجەی سییەکان

١٧-یارمەتی دەرە لە بەرەنگاربوونەوەی ماندووبوونی درێژخایەن

١٨-دژی بەردەوام بەرزبوونەوەی پەستانی خوێنە، ئەگەر ئارەزوو دەکەیت کە زۆر بە خێرایی ڕزگارت بێت لە سوتاوی و سور هەڵگەران بە خواردنی زۆرێك لە چاوەرە چارەسەرت دەبێت

١٩-چونکە شل کەرەوەیە ئامۆژگاری دەکرێت کە بخورێت لەگەڵ خواردندا لە کاتی گیرانی ( قەبزی )

٢٠-ڕۆڵێکی بەرچاو دەگێڕێ لە چارەسەری ئیلی ( تاریکی ) لە گلێنەی چاو، بۆیە زۆر باشە بۆ

چاو.

٢١-ئەگەر دەنالێنی بە لەدەست دانی قژت (وەرینی قژت) چاوماره یارمەتیت دەدات بۆ وەستانی هەڵوەرینی قژت. وە هەروەها لەگەڵ وەستانی ئازاری ددانت.

پێکهاتەی کەنگر لە ١٠٠ گرام:

کالسیۆم: ٢٠ ملگ

پرۆتین: ١٠ ملگ

فۆسفۆر: ٦٠ ملگ

ئاسن: ١ ملگ

پۆتاسیۆم: ٢٠٠ ملگ

کیلۆ کالۆری: ١٤ ملگ

کاربۆهید رات: ٣,٠ ملگ

سۆدیۆم: ٥ ملگ

ڤیتامین C: ٢٠ ملگ

چەوری: ٠,٠

ڤیتامین B١ و B٢: ٠,١٧ ملگ

ڤیتامین B٦: ٠,٠٣ملگ

المیاه: ٩٣,٢ ز

٤-وا ناسراوە کە زۆر ساردەلەبەر ئەو هۆیەیە کە بۆ وەرزی هاوین لە کاتی گەرما دا گرنگی یەکی زۆری هەیە . زۆر ناسراوە ماددەیەکی زۆری ( carative ) تێدایە.

٥-ناوی ئەم چەرەسە دەتوانیت کێشەکانی دڵ تێکهەڵاتن و یان یارمەتی ئەو منداڵانە دەدات خواردن کەم دەخۆن واتە ئارەزووی خواردنیان زۆر دەکات.

٦-ناوی ئەمە ناسراوە بەوەی کە ئەو ماددە ژەهراوییانەی کە لە لەشدا هەیە لایدەبات. ئەمە بەستراوە بۆ ئەو کەسانەی کە پەیوەستن بە نەخۆشی زەردوویی.

٧-هۆکارێکی گرنگە بۆ کەم کردنەوەی کۆکە ، تۆزی ئەم چەرەسە وە تێکەڵ کردنی لەگەڵ ئاودا ( ٢جار ) لە رۆژێك دا ئەمە دەبێتە چارەسەرێك بۆ کۆکە.

پێکهاتەی کەستەنا لە ١٠٠ گرام:

| | |
|---|---|
| کیلۆ کالۆری: | ٣٧٧ |
| کالسیۆم: | ٢٧ ملگ |
| پرۆتین: | ٢,٩ گرام |
| فۆسفۆر: | ٣٧٣ ملگ |
| ئاسن: | ٣,٨ ملگ |
| النیاسین: | ٦ ملگ |
| الریبوفلافین: | ٢٢ ملگ |
| چەوری: | ٤,١ گرام |
| فیتامین B: | ٠,٢٢ ملگ |

## گێلاس



گێلاس بەس تەندروست نییە بەڵکو بەتامیشە. بەسەرچاوەی خۆراکی بەهێز دائەنرێت و یارمەتی دەرە لە کەم کردنەوەی تووش بوون بە نەخۆشی شێرپەنجە. وە سەرچاوەیەکی بەهێزە بۆ دژە ئۆکسید لە لەشدا. هەروەها سەرچاوەی ترشی یلاغنیش. کە یەکێکە لە مادەکانی دژی نەخۆشی هەروەها مادەی perilly کحولی ( potl ) کە دژی هەموو شێرپەنجەکانە لە لەشدا. هەروەها چارەسەری هەوکردن دەکات .. یارمەتی خەوێکی نارام ئەدات. هەروەها یارمەتی کەم کردنەوەی مادەی ئەملنوم ئەدات لەشدا کە ئەمەش ئەبێتە هۆی کەم کردنەوەی پیربوونی پێش وەخت. گێلاس بە ژەمە خۆراکێکی سادە دائەنرێت.وە بە سەرچاوەیەکی ڤیتامین A.C دائەنرێت.

سووده تەندروستییەکانی گێلاس:

١-کەم کردنەوەی پیری پێش وەخت لە مرۆڤ دا وە هەروەها هۆکارێکی گرنگە بۆ نەهێشتنی ڕاڕیی.

٢-بە سەرچاوەیەکی خۆراك بە هێز دائەنرێت. دژە ئۆکسیدەو یارمەتی دەدات بۆ پاککردنەوەو شێوازی لێدانی دڵ و باشکردنی خەو. مەلنۆم دۆزراوەتەوە لەناو گێلاسدا ئەمەش هاریکاری دەکات بۆ خەوێکی باش..

٣-بە سەرچاوەیەکی باشی ڤیتامین A. دائەنرێت . ١٩ جار زیاتر ڤیتامین A تێدایە لە شلیك.

٤-سەرچاوەیەکی باشە بۆ دژە ئۆکسید لە لەش دا. ئەمە یارمەتی دەدات بۆ کەم کردنەوەی دڵ و نەخۆشیەکانی دڵ و شێرپەنجە و وە یارمەتی دەدات لە شکستەکانی لەشدا وە بەرەنگار بوونەوەی تەشەنەکردنی ڕیشاڵەکانی ناو مێشك وە لەهەمان کاتدا وەستان و

تەشەنەکردنی وە بەرەنگاربوونەوەی خانە شێرپە نجەییەکانی ناو لەش. وە بۆ وەستاندنی گەشەکردنی هەموو خانەکانی شێرپە نجە.

٥-سەرچاوەیەکی باشە بۆ ڤیتامین C. E جون. وە پۆتاسیۆم و مەگنسیۆم و ئاسن و ماددە ریشاڵیەکان و ( ).

٦-گێلاس یارمەتیدەرە لە کەم کردنەوەی ئەگەری تووش بوون بە نەخۆشی شەکرە.

٧-یارمەتی کەم کردنەوەی هەوکردن ئەدات.

٨-سەرچاوەیەکی باشە بۆ هەرس کردنی خۆراك.

٩-گێلاس مادەیەکی باشی تێدایە بۆ مێشك یارمەتی دەدات بۆ تەندروستییەکی باش و دژی شێرپە نجەی خانەی مێشکە.

١٠-یارمەتی دەدات دژی هەوکردنی سەوەقان و لینجییەکانی نێوان جومگەکان

١١-دژە بەکتریای بەهێزە. بۆ ئەو کەسانەی کە ئازاریان هەیە زیاتر بۆ ئەو کەسانەی کە زۆر بە پێ دەرۆن یان لە ئەنجامی یاری کردنێکی زۆرەوە دەبێتە هۆی رەق بوونی ماسولکەکان.

پێکهاتەی گێلاس لە ١٠٠ گرام:

کیلۆ کالۆری: ٥٧

**مەعدەنوس فەرەنجی**



**گیایەکی ناسراوە بە تام و چێژی. وە بەکاردەهێنرێت لەگەڵ هێلکە و ماسی و مریشك. بەڵام باشتر وایە دوای ئامادەکردنی ئەم خواردنانە تۆزێك لە گیا بکەین بەسەر خواردنە ئامادەکراوەکاندا چونکە بە کوڵان برژاندنی زۆر سوودەکان و تامەکانی کەم ئەبێتەوە . ئەم گیا سەرەتا لەلایەن یۆنانییەکانەوە بەکارهاتووە .**

**سوودە تەندروستییەکانی مەعدەنوس فەرەنجی :**

**١-دەوڵەمەندە بە ڤیتامین و ماددەی ئاسن.**

**٢-دەوڵەمەندە بە مادەی زنك و پۆتاسیۆم . ئاسن و منغنیز و کالسیۆم.**

**٣-دەوڵەمەندە بە ڤیتامین فسفۆر و نحاس. سلینۆم و مغنسیۆم و B.**

**٤-یارمەتی دەرە لە چارەسەرکردنی هەرس کردن ی ترشەڵۆکی گەدە وە کەم کردنەوەی ئازاری گەدە.**

**٥-یارمەتی کەم کردنەوەی زیپکە (الحب الشباب) و الاکزیما یارمەتی کەم کردنەوەی هەوکردن ئەدات کە لە حەساسیەت و توشی مرۆڤ دەبێت.**

**٦-یارمەتی باش کردنی سووڕی خوێن ئەدات.**

**٧-یارمەتی چارەسەرکردنی مایەسیری و دەوالی ئەدات.**

**٨-یارمەتی جێگرتنەوەی شلەمەنی لە لەش دا ئەدات کاتێك کەم دەکات ٩-خواردنەوەی بەشێوەی چا یارمەتی هێورکردنەوەی مێشك ئەدات.**

**١٠-یارمەتیدەرە لە چارەسەرکردنی الانفلونزا و سەرما بوون.**

١١-یارمه‌تی ده‌دات له‌ دژی سووربونه‌وه‌ و یان خراپ بوونی پێست.

١٢-ده‌توانێت یارمه‌تی بدات له‌ دابه‌زینی به‌رزبوونه‌وه‌ی په‌ستانی خوێندا.

١٣-یارمه‌تی ده‌دات له‌دژی هه‌وكردنی میزه‌ڵدان و به‌ردی گورچیله .

١٤-له‌كاتی حه‌ساسیه‌تی چاودا خواردنه‌وه‌ی چایه‌كی ئه‌م گیایه‌ ده‌بێته‌ هۆی باش بینین.

١٥-یارمه‌تی ده‌دات بۆ باش كردنی جگه‌ر.

## فاصۆلیا



لە افریقیا و اسیا لە ناوچە کوردیـەکان زۆرە. زۆر چـاکە بـۆ تەندروسـتی. کاریگـەری باشـی هەیـە لەسـەر فـشاری خـوێن ڕادەی ترشـەڵۆك لـە خوێندا. مـادەی مەگنـسیۆمی زۆر تێدایـە ڤیتـامین A زۆر تێدایـــــە. یارمـــــەتی دابەزاندنی کێش ئەدات .فاصۆلیا یەکێکە لەو خواردنانەی کە بـە ئاسـانی هـەرس ئـەبێت هەروەها ووزەیەك ئەدا بە لەش بۆ ماوەیەکی زۆر. هەروەها دەوڵەمەندە بـە کاربۆهیـدرات. دەوڵەمەنـدە بـە پـرۆتین کـە ئەمـەش یارمـەتی دەرە لـە دروسـت کردنـی پتـەوکردنی ماسولکەکانی لەش.

سووده تەندروستییەکانی فاصۆلیا:

١-فاصۆلیا دەوڵەمەندە بە مادە ڕیشاڵییەکان و کۆلیسترۆڵ دانەبەزێنێت.

٢- پامکەی قاوەیی یەکێکە لەو خۆراکانەی کە مـادە ڕیـشاڵییەکان زۆر تێدایـە کـە بـۆ ئـەو کەسانەی کە شەکرەکەیان بەرزە یارمەتی دابەزاندنی ئەدات. لـەدوای نـان خـواردن ڕێـژەی شەکر بە شێوەیەکی بەرچاو بەرز دەبێتـەوە لـە لەشـی مـرۆڤ دا بـەڵام فاصـۆلیا هۆکـارێکی گرنگە بۆ ڕێگرتن لەو بەرزبوونەوەیە.

٣-مادەی المولبینسیۆم تێدایە کە ئەبێتە هۆی لابردنی ژەهری کبریت لە لەشدا.

٤-یەك کوپ فاصۆلیا کوڵاو ٠,١٧٧٪ مادەی الموبینیسیۆم مان پێ ئەبەخشێت.

٥-کبرتیت مادەیەکە پارێزەر کە ئەکرێتە خواردنی هەڵگیراوەی ناو قوتوی شوشە هەنـدێك کـەس ئەیکـەن بـە حـساسیەت بـەڵام لـە ڕێگـای خـواردنی فاصـۆلیا ئـەم حـساسیەت کـەم ئەکاتەوە وە بۆ لێدانی دڵ و سەر ئێشە زۆر بەسوودە.

٦-فاصۆلیا مادەی ڕیشاڵی تێدایە کە زۆر دەتوێتەوە وە هەروەها هەندێك مادی ڕیشاڵی تری تێدایە کە بە ئاسانی ناتوێتەوە.

٧-یەك کوپ فاصۆلیای کوڵاو ٤٥,٣٪ پێویستی ڕۆژانەی مادە ڕیشاڵەییەکان مان ئەداتێ تەنها هۆکار نییە بۆ ئازاری ناو سکمان بەڵکو زۆر بەسوودە بۆ دابەزینی چەوری ناو سکمان. وە یارمەتی کۆئەندامی هەرس دەدات لەکاتی هەرس کردنی خواردن دا.

٨-مادە ڕیشاڵییەکان کە زۆر ئەتوێتەوە یارمەتی مرۆڤ ئەدات لە هەرس کردن دا ئەویش بە زیادکردنی مادەی زەرد.

٩-مادەە ڕیشاڵییەکان کە زۆر ناتوێنەوە یارمەتی دەرە لە کەم کردنەوە ئەگەری تووش بوون بە جەڵدەی دڵ.

١٠-فاصۆلیا دەوڵەمەندە بە مادەی ئاسن . بۆیە ووزەیەکی باش بە لەش ئەدات بە ڕێژەیەکی کەم کەلۆری تێدایە و چەوری تێدانییە وە هەروەها یارمەتی دەدات بۆ هاوسەنگ کردنی ڕێژەی شەکر لە خوێن دا.

١١-ئەم جۆرە فاصۆلییایە ووزەی پێویست دەبەخشێت بە گورچیلە.



## نۆك



نـۆك ( نـۆكی پانكـەی بـازلا هندی رسسی پامكەی. بنغال، گە نمەشـامی كـابولی ). زۆر جۆرەكانی نۆك یارمەتی دەرن لە دابەزانـدنی كێش دەزانـین یـەك كـوپ نـۆك ٥٠٪ مـادە ریـشاڵییەكان پێویـست ئەداتێ كە ئەمەش پێویستی لەشی رۆژانەیە. مادە ریشاڵیەكان یارمەتی دەرن لە نەهێشتنی بەرزبوونـەوەی شـەكر. بـۆ یەكەم جار نۆك لە ناوچە كوردنشینەكان دۆزرایەوە وە دوای لـە هنـد و پاكـستان و دەریـای سپی ناوەڕاست.

سوودە تەندروستییەكانی نۆك:

١-ئەو كەسانەی كە شەكرەیان هەیە ئەبێت نۆك زۆر بخۆن چونكە یارمـەتی دەرێكـی باشـە بۆ دابەزینی شەكرە هاوسەنگی شەكر لە خوێن دا ڕادەگرێت.

٢-خواردنی نۆك یارمەتی كشانی كۆلۆن ئەدات تۆزێك لە قەبارەی خۆی هەروەها یەرمەتی دەرە لە كەم كردنەوەی شێر پە نجەی كۆلۆن.

٣-بەخواردنی كوپێك نـۆك یارمـەتی ٥٠٪ مـادە ڕیـشاڵییەكان دەدات لـە لەشـدا خـۆراكێكی باشە بۆ ماوەیەك ووزە ( هێز ) ئەدات بە لەش هەست بە برسێتی ناكات.

٤- پرۆتین: نۆك سەرچاوەیەكی باشە بۆ منغنیز و فولیـك و ئاسـن و مغنـسیۆم و مـس ترشـی فولیكی تێدایە.

٥-یارمەتی كەم كردنەوەی نەخۆشیەكانی دڵ ئەدات وە نەخۆشی دەمارەكانی دڵ . یارمـەتی كـەم كردنـەوەی نەخۆشـییەكانی دڵ دەدات و وە نەهێـشتنی نەخۆشـی دەمارەكـانی دڵ وە دابـەزینی كۆلیـسترۆلی خـراپ و وە كۆلیـسترۆلی خـراپ و كۆلیـسترۆلی بـاش هاوسـەنگ

ڕادەگرێت لە لەشدا.

٦-بۆ ئافرەتان. تۆك مادەی کیماوی تێدایە پێی دەوترێت صابونین کە ئەمەش ئەبێتە هۆی کەم کردنەوەی شێر پەنجەی مەمك لە لەشدا.

٧-مادەی ئاسنی زۆر تێدایە کە یارمەتی ئافرەت ئەدات لەکاتی دووگیانی دا هەروەها لە شیریشدا.

٨-بەهۆی بوونی مادە ڕیشاڵییەکان زۆرە لە تۆکدا یارمەتی دابەزاندنی کێش دەدات.

٩-منغنیز. تۆك مادەیەکی باشی منغنیزی تێدایە یارمەتی ڕشتنی الانزیمی ئەدات لە لەشدا.

١٠-یارمەتی ئەدات لە قەبزی دا.

١١-مادەیەکی زۆر کالسیۆم تێدایە.

١٢-مادەی ( molybendum ) یارمەتی دەدات بۆ لابردنی مادە ژەهرییەکانی لەش و وە بۆ کەم کردنەوەی خێرایی لێدانی دڵ.

١٣-تۆك ڕێژەیەکی زۆر مادە ڕیشاڵییەکانی تێدایە لە دوای خواردنی نان ڕێژەی شەکر لە لەشدا بەرز دەبێتەوە، بەڵام تۆك هۆکارێکی گرنگە بۆ نەهێشتنی ئەو ڕێژەی بەرزبوونەوەی شەکرە لە خوێن دا. تۆك هەڵبژاردەیەکی باشە بۆ ئەو کەسانەی کە نەخۆشی شەکرەیان هەیە.

پێکهاتەی تۆك لە ١٠٠ گرام:

ترشافۆلۆم: ٦٦ ملگ

ئاسن: ١,٨ ملگ

کیلۆ کالۆری: ١٢٣

فیتامین B٦: ٠,١٤ ملگ

مادە ڕیشاڵییەکانی: ٦,٧ گم

## میوەی کیوی



تەندروست نیە بە تەنها بەڵکو زۆریش بەتامە لە ڕاستیدا ئەم میوەیە چینییە. ناوە ڕاستییەکەی تری ڕێوی صینی یە ( جۆیسس بێری ) پێ ئەوترێت ناوەکەی گۆڕاوە بۆ کێوی بە هۆی بازرگانی کردنەوە ناوەکەی گۆڕاوە. ئەم ڕووەکە بە دارەوەیە وەکو زۆربەی میوەکانی تر.

سووده تەندروستییەکانی میوەی کیوی:

١-ئەم میوەیە مادەی بەکتین تێدایە . کە ئەمەش چەوری کۆلیسترۆڵ کەم ئەکاتەوە.

٢-هەروەها یارمەتی دەرە بۆ کەم کردنەوەی شێر پە نجەی جگەر .

٣-خواردنی کیوی یارمەتی کەم کردنەوەی شێر پە نجەی پێست ئەدات.

٤-بەهۆی ئەو ترشیەی کە تێدایە پزیشکە چینییەکان بڕوایان وایە کە ئەبێتە هۆی کەم کردنەوەی گیرانی بۆرییەکانی خوێن.

٥-دژە ئۆکسیدە بەهۆی ئەو ترشیەوە.

٦-بەهۆی مادەی لوتین کە تێدایە یارمەتی کەم کردنەوەی شێر پە نجەی بروستات و سی ئەدات.

٧-کیوی لەش ئە پارێزێت لە فترات کە لەخواردنی جگەرە توشی مرۆڤ ئەبێت کە ئەبێتە هۆی شێر پە نجە.

٨-ماددەیەکی چەوری خۆراکە ڕیشاڵییەکانی تێدایە باشە بۆ هەرس کردنی خواردن لە گەدەدا. ڕێگری دەکات لە نەخۆشی شێر پە نجە و وە دژی قۆڵۆن دەوەستێت.

٩-دەوڵەمەندە کیمۆ بە phytochemicalsixanthopylis کە ئەمەش ڕێگری ئەکات لە کوێربوون.

١٠-کیوی دەوڵەمەندە بەمادەی بیتاکارۆتین کە دژە ئۆکسیدە لە لەشدا هەروەها ڤیتامین C,E تێدایە ئەویش یارمەتی دەرە بۆ ئەوەی کۆلیسترۆڵی باش بەرزبکاتەوە لە لەشدا.

١١-کیوی مادەی مەگنسیۆم تێدایە بە ڕێژەی ٪D٧٦ کە ئەمەش یارمەتی مرۆڤ دەدات لە کەم کردنەوەی ئەگەری تووش بوون بە نەخۆشی و بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن و نەخۆشی

هەوکردنی دڵ .

١٢-مرۆڤ دەپارێزێت لە ڕەبۆ.

١٣-یارمەتی منداڵ ئەدات لە ئەگەری سك چوون زەردبوون.

١٤-لە نیوزیلاندا بڕوا وایە کە یارمەتی دەرە لە کەم کردنەوەی خەمۆکی لە مرۆڤدا .

١٥-ڕێژەیەکی زۆری ترشەلۆکی ئەمینۆ ئەمەش بۆ ئەو کەسانەی کە یاری لەش جوانی دەکەن وو وە زیادکردنی ماسولکەکانی لەشی مرۆڤ پێویستە .

١٦-یارمەتی دەدات بۆ تەندروستی باش و ڤیتامین لە لەشدا وە دژە ( oxidant ) ە

١٧-شەکرێکی تەندروست و سروشتی ( ئەلحول ) لەناو مێوی دا هەیە. کە ئەمەش کاریگەری باشی هەیە لە پاك کردنەوەی نەخۆشی شەکرە.

پێکهاتەی میوەی کیوی لە ١٠٠ گرام:

| | |
|---|---|
| کۆلسترۆڵ: | ٠ ملگ |
| کالسیۆم: | ٢٦ ملگ |
| پرۆتین: | ٠،٩٩ ز |
| الگاقە: | ٦١ |
| فۆسفۆر: | ٤٠ ملگ |
| ئاسن: | ٠,٤١ ملگ |
| پۆتاسیۆم: | ٣٣٢ ملگ |
| کاربۆهیدرات: | ١٤،٨٨ ز |
| مەگنیسیۆم: | ٣٠ ملگ |
| سۆدیۆم: | ٥ ملگ |
| النیاسین: | ٠,٥٠٠ ملگ |
| الریبوفلافین: | ٠,٠٥٠ ملگ |
| الپیامین: | ٠,٠٢٠ ملگ |

چەوریە بەسودەکان( چەوری ): ٠,٤٤ ملگ

مادە ڕیشاڵیەکان: ٣،٤ ز

| | |
|---|---|
| فیتامین C: | ٧٥,٠ ملگ |
| فیتامین A: | ١٧٥ وحدە دولیە |
| المیاە: | ٨٣،٠٥ |

## سیر



سیر دەرمانی سەرما بردنە / دەرمانی شێرپەنجە و نەخۆشیەکانی دڵ و بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن و هەوکردنەکان و لاوازی سێکسی یە ، لێرەدا چاوێك دەخشێنین بە سوودەکانی سیر کە بەخواردنی بەسەرمان دێت. سیر لەسەردەمانێکی زۆر کۆنەوە سوودی لێ وەرگیراوە بۆ تەندروستی، وە لێرەدا ئاماژەی جۆراوجۆری پێکراوە لەسەر چاوەکانی ( هەڵکەنراوی سەر دیوار ) کە میسریە کۆنەکان نوسیویانە کە گرنگی سیر دەردەخەن وەکو ئامرازێك بۆ گەشە پێدانی هێز و بەرگری. لە قەبری ( توت عنخ ئامون ) دا لە شانی ئاڵتوون سیر دۆزراوەتەوە کە بەکاریان هێناوە بۆ دژایەتی کردن و ( تووش بوون بە نەخۆشی ) – سەر ئێشە و مشە خۆرەکانی کۆڵۆن و بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن و هەڵئاوسان و کیس کردنی پیس.

سوودە تەندروستییەکانی سیر :

١-سەرماخواردن( سەرما بردن ) :. سیر بۆ زۆر نەخۆشی بەکاردێت بە تایبەت بۆ سەرما وە بەکارهێنانی سیر رەنگە سەرەتا ببێتە هۆی ( هەنسککردن ) بۆیە زۆر خەڵك مێخەك یان بابەتێکی دیکەی لەگەڵ دا بەکاردێنن بۆ رزگاربوون لەو بۆنە.

چۆن ڤاژە سیر یارمەتی دەرە؟ یارمەتی کۆئەندامی بەرگری دەدات؟ وە رێ بە کاری بەرگری دەدات کە گۆڕمێکی گەورە بەدەست بێنێ وە هەروەها یارمەتی پاراستنی ئاستی کەرەستەی دژە ئۆکسید دەدات لە رژێمەکەماندا.

٢-نەخۆشیەکانی دڵ/ کۆمەڵێك هۆکار هەن کە دەبنە هۆی نەخۆشییەکانی دڵ، لێرەدا کۆمەڵێك سوود لە سیر دەخەینە روو کە رێگرە و چارەسەرە، بەڵام چۆن یارمەتی دڵمان دەدات لە پلەی یەکەمدا یارمەتیمان دەدات بۆ کەم کردنەوەی ئاستی کۆلیسترۆڵی خوێن

لەبەر ئەوەی HDL زیاد دەکات واتە کۆلیسترۆلی باشمان دەداتێ و ڕێگرە لە LDL (کۆلیسترۆلی خراپ) ئەمەش مەترسی پێك هێنانی نیشتوەکان لە خوێنبەرەکان کەم دەکاتەوە، قاشێك سیر لە یەك ڕۆژدا بە ڕێژەی ٪٩ کۆلیسترۆڵ دادەبەزێنێ وە هەروەها خوێنبەری الابهر دەپارێزێت ، خۆراك ، هۆکاری ژینگەیی ، وەکو جگەرە کێشان کە لەوانەیە ببێتە هۆی زیان لە خوێنبەر، سیر یارمەتی دەدات بۆ ڕەق نەبوونی وە بەکارهێنانی ڕێك و پێکی سیر دەمان پارێزێت لە پیربوونی زوو وەخت.

٣-کاریگەری سیر لەسەر شێرپە نجە: ئێمە پێویستمان بە یاسایەکی تەندروستی هەیە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی شێرپە نجە/ ئێمە بە دڵنیاییەوە دەزانین کە سیر پاڵ پشت و یارمەتی ئەم یاسایە دەدات ، وە بە دڵنیاییەوە سیر توانایەکی هەیە بۆ ڕێگری کردن لە پێك هاتنی خانەکانی شێرپە نجە کە ڕێگرە لە پێك هاتنی کەرستەکان و گەشەی خانەی شێر پە نجەیی، سیر بە شێوەیەکی تایبەت بە سوودە لە بەرگری کردن لە شێرپە نجەی سورێنچك و مەمك و گەدە و پرۆستات و شێرچە نجەی میزڵدان،




یارمەتی کەم کردنەوەی وەرەم (کیس) دەدات، ناهێڵێ گەورە بێت.

لە توێژینەوەکانی شێرچە نجەی مەمکدا دەرکەوتووە کە سیر ڕێگرە لە گەشەی پێك هاتەکانی شێرپە نجەی پەیوەندیدار بە خانەکانی شێرپە نجەی مەمك.

٤-بەرزی پەستانی خوێن/ سوودێکی دیکەی سیر بۆ دڵ توانایەتی بۆ ڕێگرتن لە پەستانی خوێن جارێکی دیکە ، ئەو مادە کیمیاییە کە لە سیردا بوونی هەیە ناوی (ajoene) یە خوێن کەم دەکات و ڕێگرە لە توش بوون بە جەڵتەکان. لەو شوێنانەی کە سیر دەخورێت

ئەوە تێبینی دەکرێت کە هەمیشە بە کەمی ڕووداوی بەرزی پەستانی خوێن و نەخۆشیەکانی دڵ ڕوودەدات.

لەگەڵ ئەوەشدا کە سیر سوودی تەندروستی زۆری بۆ دڵ هەیە بەڵام چینیەکان سیر یان بەکارهێناوە لە گژوگیای چینی بۆ چەند سەدەیەك لە چارەسەری لێشاوی سنگ و توونـد بوون و لێدانەکانی سووڕی خوێن.

٥-دژایەتی کردن/ وەك ئاشکرایە کە سیر دژە بەکتریایە کاتێك ڕووبەڕووی خانەی بەکتریایی دەبێتەوە لە دۆخەکانی دیکەدا سیر وەکو پاکژکەرەوەیە.

وە سیر لە جەنگی جیهانی دووەمدا بەکارهێنراوە وەکو چارەسەر بۆ برینی سەربازەکان لە جەنگدا، بۆ تیفۆئیدو کولێرا، تەنها ئەوە نییە میکرۆب لەناوبەرێت بەڵکو دژی ڤایرۆس و کەڕوو قارچکەکانە و دژی مشەخۆرەکانی کۆڵۆن چالاکە، لە پاڵ ئەوەی کە سیر گرنگە و ناسراوە ئەشێ دابنرێت وەك تەنها مادەیەك کە دژە زیندەییەکانە لە ڕووبەڕو بونەوەی دوژمنەکانی .

٦-لاوازی سێکسی/ سیر یارمەتیدەرە لە لاوازی سێکسی ، ئێمە دەزانین کە سیر یارمەتیدەرە لە سوڕی خوێن و خوێن هێنەر و خوێنبەرەکان – لە کاتی یارمەتیدانی لە جەردانی ئەنزیم – ناو دەبرێت بە نیتریك- سینسییز – ئۆکسید – ( ئۆکسید )) لێرەدا کۆمەڵێك پێك هاتە لە سیر یارمەتی دەرە لە بەرهەم هێنانی ئەم ئەنزیمە لەو خەڵکانەی کە دەناڵێنن بە دەست کەمیی توانای سێکسیەوە.

٧-سکپڕی/ ئافرەت دەتوانێت سود لە سیر وەربگرێت لە ماوەی سکپڕیەکەیدا تەواوکاریەکانی سیر یارمەتی زیادکردنی کێشی و شیردەدات لەگەڵ زیادبونی ترسی کەم کردنەوەی کێش لە کاتی لە دایك بوون. وە کەم کردنەوەی هۆکارە مەترسی دارەکانی دیکە لە کاتی لە دایك بوندا، وەکو ژەهراوی بوونی سکپڕی ، ئەمەش پەیوەندی هەیە بە بەرزبوونەوەی پەستانی خوێنەوە.

لێرەدا سودێکی تر هەیە لە سیردا وەکو بەهێزکردنی زاکیرە و خوێندن و فێربوون لە ئیش دا وە سیر یارمەتی لەناوبردنی ژەهراوی بونی لەش دەدات لە کاتی زیادکردنی ئاستی مادەی دژە ئۆکسید ، وە کەم کردنەوەی دروست کردنی پێك هاتە ژەهرییەکان.

وە بەم شێوەیە دەبینین کە سیر لە زۆر بواردا بەکاردەهێنرێت ، بەڵام چی بکەین بۆ پاراستنی تەندروستیمان؟ ئەگەر کەسێك ویستی یەکەم دەبێ هەستێت بە لێکۆڵینەوە لە گۆڕانکارییەکان کە بەسەر شێوازی ژیانماندا هاتووە کە پەیوەندی بە تەندروستیمانەوە هەیە پێویستە ئاگاداری پزیشك بکەینەوە لە کاتی بەکارهێنانی ڕێژەیەکی زۆر لە سیر چونکە دەبێتە هۆی بەرزبونەوەی پەستانی خوێن وە بە تایبەت لە کاتی ئە نجام دانی نەشتەرگەری ، وە لێرەدا سیر کاریگەری دەکاتە سەر نەشتەرگەرییەکە، دوای دڵنیابوون لە سەلامەتی ئەوسا سیر بەکاربهێنە، چۆن دەتوانیت سوودێکی گەورە لە سیر بەدەست بهێنی؟ بە زیادکردنی بۆ خۆراکمان لە سەرەتادا بە پێی خواردنەکە ، وە لەکاتی قاشکردنی یاخود کەرت کردنی دەبێ زوو بە زوو بەکاری بهێنین بۆ لێنان بۆ ئەوەی مادە سوود بە خشەکانی لە دەستمان نەچێ لە کاتی بەکارهێنانی سیر لە سەرەتاوە دەبێتە هۆی تیاچونی مادەی کبریت کە لە سیر دا هەیە ( وە کبریت یەکێکە لە مادە بە سوودەکان ) بۆیە لە کۆتاییدا سیر ئامادە بکە بۆ بەدەست هێنانی گەورەترین سوود. سیر بە سودە چ بە کاڵی چ بە لێنان بێت بەڵام زۆر خەڵك وای بەباش دەزانن کە بەکاری بهێنن لەگەڵ خواردنێکی دیکەدا بۆ دورکەوتنەوە لە تام و بۆنە ناخۆشەکەی.

ئەو بڕە گونجاوە چەندە بۆ بەکارهێنانی سیر؟ ئەگەر تۆ سیری تازە زیاد دەکەی بۆ خواردنەکەت سەرەتا بە کەمی لەبەر ئەوەی زۆر لە سیر ڕەنگە ببێتە هۆی لاوازی و خاڵی کردنەوەی گەدە، ڕەنگە بەکارهێنانی بڕێکی کەمی سیر زۆر سودی تەندروستی گەورەی هەبێت، زیادکردنی سیر بۆ خواردنەکان لە باتی زیادکردنی بەهارات نییە بۆ خواردنەکان تەنها، بەڵکو هەستێکی باشت لا دروست ئەبێت کە هەست دەکەی تۆ شتێکی باشت بۆ خۆت کردووە.

پێکهاتەی سیر لە ١٠٠ گرام:

ئاسن: ١,٤ ملگ

کیلۆ کالۆری: ١٣٨

ڤیتامین C: ١٤ مگ

## سەلکی کەرەوز



سە لکی کەرەوز ناسراو بووە لەلایەن نەغریقییەکانەوە لە ماوەی ٢٥٠٠ ساڵدا، لە شیکردنەوەی سەلکی کەرەوز دەرکەوت کە خاوەنی ڤیتامین A، B، ج، وە کانزاکان وەکو/ئاسن و یۆد و مس، مەگنسیۆم و پۆتاسیۆم و کالسیۆم و فۆسفۆر و وە ڕەگەزی کیمیای هێورکەرەوە .

سەلکی کەرەوز بۆ هەموو کەسێك گونجاوە کە خاوەن تەندروستییەکی باش بێت و وە بە نەکوڵاویش دەخورێت، وە بە هاڕاویش دەخورێت وە بە ناسکی، یان نەجویرێت بە ددان بەڵام ڕێگە نادرێت بەو کەسانەی کە کۆڵۆنیان لاوازە و نەو کەسانەی کە توانای هەرس کردنیان قورسە کە بیخۆن.

پێشنیار دەکرێت بۆ نەوانەی کە توش بوون بە قەڵەوی و شەکرە و هەوکردنی جومگەکان و ڕۆماتیزم و هەوکردنی گورچیلەیی کە بیخۆن، وە هەروەها وەکو بەهێزکەرێکی گشتی بۆ خانەکانی لەش و نەرم کەرەوە و پاککەرەوەی بۆری میز و خوێنە، وە دژی خراپ هەرس کردن و قەڵەوییە.

سووده تەندروستییەکانی (( سەلکی کەرەوز )):

١-بەرز بوونەوەی کۆلیسترۆلی LDL ڕەنگە ڕەگەزێك بێت لە ڕەگەزە گرنگەکان ، کە کۆدەبێتەوە لە دیواری ناوەوەی خوێن بەرەکان، کە دەبێتە هۆی نەرم و نیانی خوێن بەرە تەسکەکان.

٢-کەم بوونەوەی کۆلیسترۆڵ HDL کۆلیسترۆڵ دووردەخاتەوە لە خوێن بەرەکان و

گەڕانەوەی بۆ جگەر ، دەبێتە هۆی تێ پەڕاندنی لە لەشدا.

٣-بۆ چارەسەری بەرزی چەوری سیانی: لێرەدا کۆمەڵێك چەوری کە دەبنە هۆی قەڵەوی و کەمبوونەوەی چالاکی جەستەی و جگەرەکێشان، بەکارهێنانی مادەی کحولی.
٤-لە کاتێکدا کۆلیسترۆڵ ( چەوری ) لە خوێندا کۆدەبێتەوە ئەبێتە هۆی کەم بونەوەی چالاکی دڵ، و کەم بوونەوەی تێ ڕژانی خوێن بۆ دڵ، وە هەندێك هۆکاری زۆر کە بەشدارن لە توش بوون بە نەخۆشی دڵ وەکو تەمەن و جنس و ڕەگەز و مێژووی خێزانی و جگەرەکێشان ، بەرزی کۆلیسترۆڵ، بەرزی پەستانی خوێن و شەکرە و قەڵەوی بۆ کەم کردنەوەی مەترسی بۆ توش بوون بە نەخۆشییەکانی دڵ، یاخود ئەگەر تۆ دوچاری نەخۆشی دڵ هاتوی وە حەزت لێیە لە گۆڕینی ڕژێمی خۆراکیت تایبەت بە تۆ لە زۆربەی کات دا ئامۆژگاری دەکرێ ی لەلایەن چاودێران و پێشکەوتوانی تەندروستی بەکارهێنانی سەلکی کەرەوز کە ئەنجامی ئیجابی گەورەی دەبێت لەسەر تەندروستیت.

پێکهاتەی سلکی کەرەوز لە ١٠٠ گرام:
کیلۆ کالۆری ١٤
کاربۆهیدرات: ٦ گرام
مادە ڕیشاڵیەکان: ١،٣٤ ز

## قاوه



مێژووی قاوه ئەگەڕێتەوە بۆ پایتەختی ئەسیوبیا کە ناوی addis abiba ئەو ناوچەیە کافـە یـان کەیفـە وە بـە هۆڵەنـدی پـێ ئـەڵێن کـۆفی ئێمـە نـازانین کـۆفی لـە نـاوی ئەم ناوچەیەوە هاتووە یان نا وە لای کـورد و عـەرەب زۆرێـك لە ناوچەکان بە قاوە ناسراوە و جاران بەکارهاتووە بۆ شەراب پێش ئەوەی ناوی قاوەی لێ بنرێ بۆیە لای ئەورووپییەکان بە کۆفی ناسرا.

لە وڵاتە عەرەبییەکان ناسراوە بە omaval shadhili ،

ئەم دەرمانە بەهێزە توانی خۆی بخاتەوە ناو خەڵك.

لێرەشدا چەند شتێك هەیە لەسەر قـاوە پێویستە بیـزانین چـەند بەشێکی گـەورە هەیـە لەسـەر سـوودەکانی قـورمی مەترسـییەکانی گـەورەترین بـەش بـۆ کـۆفی خواردنـەوە سەرزەنـشتییەکە چـەند بـەرزی دژە ئۆکـسید ئـەم هۆکـاری ئەوەیـە کـە نوسـراوە بـۆ کـەم کردنـەوەی مەترسـییەکانی شـێرپەنجەکان. شـێرپەنجەی مـەمك، شـێرپەنجەی کۆڵـۆن زۆرترین بەشیشی لەسەر شێرپەنجەی پرۆستات، ئەم هـەموو شێوازە کاریگـەری هەیـە لـە مەترسییەکانی ئەم نەخۆشییە ترسناکانە هەروەکو لە خوارەوە بە خاڵ بۆتان ئەژمێرین.

سووده تەندروستیەکانی قاوه:

١-حەوانەوەی تەنگە نەفەسی.

٢-حەوانەوەی سەرئیشە.

٣-پارێزگاری کردنی پۆشای.

٤-نزم کردنەوەی مەترسی لەسەر نەخۆشی شەکرە.

٥-کەمکردنەوەی مەترسیەکانی لەسەر مێشك.

٦-کەم کردنەوەی مەترسییەکان لەسەر هەوکردنی جگەر

یاخود زیانەکانی جگەر بۆ ئەو کەسانەی مودمینن بە مشروبات.

٧-بۆ کەمکردنەوەی مەترسییەکانی نەخۆشی جومگەکان

٨-بۆ کەمکردنەوەی مەترسییەکانی سەر دڵ و نەخۆشیەکانی چەوری دڵ.

٩-کەمکردنەوەی مەترسییەکانی بۆ سەر نەخۆشی لێدان یاخود سەکتەی دڵ و مێشك.

١٠-کەمکردنەوەی مەترسییەکانی بەردی گورچیلە.

١١-بەرز کردنەوەی وزە لە لەش دا.

١٢-دورانی مێژو کارەکانی.

١٣-باشکردنی کارەکانی مێشك.

١٤-باشکردنی وریاکەرەوەکان.

١٥-کەم کردنەوەی نەخۆشیەکانی شێر پە نجەی مێشك

١٦-کەم کردنەوەکانی شێر پە نجەی کۆلۆن.

١٧-کەم کردنەوەی شێر پە نجەی پرۆستات.

١٨-کەم کردنەوەی شێر پە نجەی سنگی ئافرەت.

شتێکی زۆر گرنگ و سەرسامە لیستێك بۆ کوپێکی بچکۆلەی ئاوێکی قاوەیی، زۆر خواردنی باش نیە چەند ئەو خواردنە باشیش بێت لەبەر ئەوە من ئاگاداریتانە ئەمەوە بۆ چەند خاڵێك ڕوونی ئەکەینەوە.

**زیانەکانی زۆر خواردنی قاوە:**

**١-وشك بوونەوە**

**٢-ترس**

**٣-دڵەکزێ**

**٤-کەم شەکر لە خوێن دا**

**٥-هۆگربوونی**

**٦-کێشەکانی نەزۆکی**

**٧-قاوەی وردکراو بەکارهێنانی بە بێ بەکارهێنانی فلتەر نەبێتە هۆی وردە وردە بەرزبوونەوەی چەوری خوێن.**

**٨-زۆر کەس کە قاوە بخۆن لە لەشیان دا بەهێواشی نەبێتە هۆی خواردنەوەی دوو کوپ یان زیاتر قاوە لە رۆژێك دا دەبێتە هۆی زیادکردنی مەترسی لەسەر دڵ و زیادکردنی نەخۆشیە چەورییەکانی دڵ.**

## گوێزی هندی

لێرەدا جیاوازی لە نێوان کرێمی گوێزی هیندی و شیری گوێزی هندی دا هەیە. یەکەم کرێمی گوێزی هندی لە بەشی ڕەقی گوێزی هندیەکەدایە ، وە ئەم کرێمە بەکاردێت وەکو بەدیلێکی نایاب بۆ بەروبومەکانی ئەلبان و وەهەندێ شیرینی دیکە.

بەڵام شیر بە دەستی دێنی لە ڕێگەی زیادکردنی ئاو بۆ کرێمی گوێزی هندی، بۆ گەیشتن پێ ی بە شیرێکی بە تام و خاوەنی پێـک هاتـەی گونجاو پێویستە ٤ کوپ ئـاوی بـۆ زیـاد بکـەین بـۆ هەموو پارچەکانی گـوێزی هینـدی، دواتـر تێکـدانی تێکەڵەکـە لـە ڕێگـەی



بەکارهێنانی شیری پاڵاوتەی پاك بەس بە تەنها بە کردنەوەی گوێزە هندیەکە پێویستە لە سەلاجە هەڵبگیرێت لەبەر ئەوەی ناکرێـت لـە دوای یـەك هەفتـە بەکاربرێتـەوە، نـابێ شیری گوێزی هندی ببەسترێت لە فریزەردا. لێرەدا کۆمـەڵێکی زۆر لـە کارگـەکان هەڵدەسـتن بە دروست کردنی بەروبومەکانی گوێزی هندی بۆیە پێویستە باش بگەڕێین بۆ جـۆراو جـۆری نیشانەی بازرگانیەکانی و ئەوەش هەڵبژێرین کە دەگونجێت لەگەڵ پێداویستییەکا نمان.

**سووده تەندروستییەکانی گوێزی هندی:**

**١-گوێزی هندی ڤایرۆس ی ئەنفۆنزا لەناو دەبات و سورێژە و هەوکردنی جگەر C ،نایدز لەناو دەبات و کۆمەڵێ نەخۆشی دیکە.**

**٢-بەکتریای قورحە و هەوکردنی گەروو و هەوکردنی بۆریەکانی میز و نەخۆشیەکانی پوك و خوران و پوکانی ددان و هەوکرنی هەناسەدان ، سیل و نەخۆشیەکانی دیکە.**

**٣-قارچکەکان لەناو دەبات و ترشاو ( هەڵاتوو ) کە دەبێتە خۆی ناساغی هێلکەدانەکان ، زیپکە و زیپکەی ناو دەم و هەندێك نەخۆشی دیکە.**

**٤-راونان و کوشتنی کرمی شریتی ئەسپێ و مشە خۆرەکانی دیکە.**

**٥-زیادکردنی سەرچاوەی وزەی خۆراك .**

**٦-یارمەتیدەرە بۆ زیادکردنی ووزە و توانای هەڵگرتن، وە باشترکردنی چالاکی جەستەیی و وەرزشی.**

**٧-هەرس کردن چاکتر دەکات.**

**وە مژینی مادە خۆراکیەکانی دیکەی وەکو ڤیتامینەکان و کانزا و ترشەکانی ئەمینی.**

**٨-چاککردنی دەردانی ئەنسۆلین و بەکارهێنانی شەکر لە خوێندا.**

**٩-کەم کردنەوەی پەستانی سەر رێك خەری پەنکریاس و لەش.**

**١٠-کەم کردنەوەی ئەو هۆکارانەی کە پەیوەندییان بە هەوکردنی پەنکریاسەوە هەیە.**

**١١-یارمەتی دەرە بۆ کەم کردنەوەی نیشانەکان و کەم کردنی مەترسییەکانی تەندروستی کە پەیوەندیدارە بە نەخۆشی شەکرەوە.**

**١٢-کەم کردنەوەی کێشە پەیوەندیدارەکانی پەیوەست بە مژین.**

**١٣-چاکترکردنی مژینی کالسیۆم و مەگنسیۆم و پالپشتی بەرەو پێشبردنی ئێسك و بەهێزکردنی ددانەکان.**

**١٤-یارمەتیدەرە بۆ پارێزگاری کردن لە بونی ئێسکەکان.**

**١٥-یارمەتیدەرە بۆ کەم کردنەوەی نەخۆشی زراو.**

**١٦-کەم کردنەوەی هۆکارەکانی توش بوون بە نەخۆشی کۆڵۆن.**

**١٧-چاککردنی ئەرکی هەرس لە گەدەدا.**

**١٨- کەم کردنەوەی ئازار.**

**١٩-کەم کردنەوەی هەوکردن.**

**٢٠-یارمەتی کۆئەندامی بەرگری دەدات..**

**٢١-لەش دەپارێزێت لە شێرپەنجەی مەمك و کۆلۆن و جۆرەکانی تری شێرپەنجە.**

**٢٢-ئەگەر هاتو دڵ ناساغ بوو ئەوا یارمەتی باشتر کردنی ڕێژەی کۆلیسترۆل دەدات وە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی نەخۆشیەکانی دڵ.**

**٢٣-یارمەتی دەدات لە ڕێگری کردن لە نەخۆشیەکانی پوك و لەناو چونی ددانەکان.**

**٢٤-لە باتی دژە ئۆکسیدەکان کاردەکات بۆ پاراستن.**

**٢٥-یارمەتی پاراستنی لەش دەدات لەو ڕەگە ئازادە زیان بەخشانەی کە دەبنە هۆی دەرکەوتنی نەخۆشی.**

**٢٦-یارمەتی پارێزگاری کردن دەدات لە دژی نەخۆشییەکانی گورچیلە و هەوکردنی میزڵدان.**

**٢٧-تواندنەوەی بەردی گورچیلەکان.**

**٢٨-یارمەتی دەرە لە ڕێگەگرتن لە نەخۆشیەکانی جگەر.**

**٢٩-کەمتر تا ووزەی گەرمی تیادایە لە چاو چەورییەکانی تر.**

**٣٠-یارمەتی فەرمانی ڕژێنی دەرەقی دەدات.**

**٣١-یارمەتی لەدەست دانی کێشی زیادەی لەش دەدات لە ڕێگەی زیادبوونی ڕێژەی الایض.**

**٣٢-لە لایەن لەشەوە بەکاردەهێنرێت بۆ بەرهەم هێنانی ووزە وە خەزن کردنی لە شێوەی چەوری لەش وەکو چەوری کەرەستەی خۆراکی تر.**

**٣٣-کەمکردنەوەی هۆکاری پەیوەندی دار بە نەخۆشیەکانی.**

**٣٤-یارمەتی هاوسەنگکردنی کیمیایی سروشتی مرۆیی دەدات.**

**٣٥-یارمەتی کەم کردنەوەی وشکی پێست و کەرێشك دەدات.**

**٣٦-زیادکردن و جوانکردنی تەندروستی قژ و پێست.**

**٣٧-زیادکردنی پاراستن لە ئەو نیشانانەی کە لە تیشکی سەروبنەوشەی هەیە لە خۆردا.**

**٣٨-یارمەتی ئەدات بۆ زاڵ بوون بەسەر کرێش دا.**

٣٩-لە کاتی گەرم کردنی بۆ پلەی ئاسایی لە لێنان زیانی نیە وەکو زەیتە رووەکییەکانی تر.

٤٠- پاشماوەی زیانبەخش جێ ناهێڵێ.

٤١-لێدانی دڵ ئارام دەکاتەوە.

٤٢- پێستی لەش دەپارێزێت لە توشبوون بە کاریگەری ماددەی کیمیاوی.

٤٣-لە کاتی توشبوونی ماسوولکەکان بە برین یارمەتی دەدات بە خێرایی یەك بگرێتەوە.

٤٤-خوێنبەرەکان دەپارێزێت لە رەقبوون، کە ئەوەش دەبێتە چارەسەری نەخۆشی دڵ. ٤٥-گوێزی هندی خۆی وەك میوەیەك هیچ مەترسیەکی نیە لەسەر تەندروستی.

٤٦-سوود وەرگرتن لە چەوری و ترشیە بنچینەیەکان زیاد دەکات و دەیان پارێزێت. ٤٧-کاریگەریەکانی هیلاکی درێژخایەن کەم دەکاتەوە.

٤٨-کاریگەریەکانی گەورەبوونی پرۆستات کەم دەکاتەوە.

٤٩-جەستە دەپارێزێت لە قەڵەوی و زیادبوونی کێش.

٥٠-کاریگەریەکانی پەیوەندیدار بە ئەگزیما و هەوکردنی پێست کەم دەکاتەوە.

٥١-رێگە نادات بە دەرکەوتنی چرچی پێستی دەموچاو، و پەڵەی تەمەن درێژی.

ئاوی گوێزی هندی

١-خواردنی ئاوی گوێزی هندی یارمەتی پاراستنی ساردی لەش دەدات و هەورەها یارمەتی دەرە لە پاراستنی پلەی گەرمی لەشی ئاسایی.

٢-ئاسانکردنی گواستنەوەی چالاکی مادە خۆراکیەکان و ئۆکسجین بۆ خانەکان.

٣-خواردنی ئاوی گوێزی هندی دڵەراوکێ ناهێڵێت و بەکاردێت لە رێگەی دەمەوە و دەبێتە هۆی گەرانەوەی هیدراتی لەش، وە لەش پڕ دەکات بە شلەمەنی کە لەماوەی وەرزشکردندا لەش لەدەستی داوە بە شێوەیەکی سروشتی

٤هەروەها یارمەتی دەدات بۆ زیادکردنی کرداری الایض لە لەشدا.

٥- پاڵی بەهێز دەبەخشێت بە کۆئەندامی بەرگری و توانای لەش بەهێز دەکات بۆ لەناوبردنی ژەهراوی بون و بەرەنگار بوونەوەی نەخۆشی.

٦-ئاوی گوێزی هندی / پاکژ کەرەوەیەکی چالاکە بۆ کۆئەندامی هەرس.
٧-بەسوودە بۆ نەخۆشی شەکرە و دەست دەگرێت بەسەر نەخۆشی شەکرەدا.
٨-ئایدز/ یارمەتی لەش دەدات بۆ بەرەنگاربوونەوەی ڤایرۆسەکان کە دەبنە هۆی ئەنفلۆنزا و ئایدز.
٩-هاوسەنگی پلەی ترشی گەرەنتی دەکات وە مەترسی لە توش بوون بە شێرپەنجە کەم دەکاتەوە.
١٠-وە هەروەها بەسوودە لە چارەسەری بەردی گورچیلە و بۆری میز.

رۆنی گوێزی هندی

١-قژ/ رۆنی گوێزی هندی یەکێك لە باشترین خواردنی تەندروستی بۆ قژ یارمەتیدەرە بۆ گەشەی قژی تەندروست و دەم و چاوێکی بێگەرد، زەیتی گوێزی هندی ، هەڵسونی سروشتی( ئاسایی ) سەر بە رۆنی گوێزی هندی، سەرت وا لێدەکات بەتاڵ بێتەوە لە رشك و ئەسپێ و کرێش ، رشکی سپی، وە ئەگەر بنی سەرت ووشکە، ئەتوانیت رۆنی گوێزی هندی بەکاربێنی لە ناوچەیەکی فراوان لە قژت بۆ پارێزگاری کردن لێی، وە ئەرم کەرەوەیەکی نایابە وە یارمەتی دەدات بۆ قژێکی لەناوچووی وە هەروەها بە دەست هێنانی پرۆتینی بنچینەیی کە پێویستە بۆ خۆراکی قژی لەناوچوو.

هەروەها زەیتی گوێزی هندی بەکاردێت بۆ بەرهەم هێنانی نەرم کەرەوە جیاوازەکان وە هەندێ کرێم کە دژی کرێشی سەرن.

٢-بەکارهێنانی زەیتی گوێزی هندی بۆ رزگاربوون لە هیلاکی و ماندوو بوون دادەنرێت کە رۆنی گوێزی هندی هێورکەرەوەیەکی نایابە هەروەها بۆ لەناوبردنی دڵە راوکێ زۆر باشە لەکاتی هەڵسونی قژی سەر بە رۆنی گوێزی هندی بە شێوەیەکی نەرم، یارمەتی لابردنی ماندووبونی عەقلی ( هۆشی ) دەدات.

٣-بایەخ دان بە رووخسار/ زەیتی گوێزی هندی نایابە بۆ هەڵسوون و شێلانی دەم و چاو هەروەها نەرم کەرەوەیەکی چالاکە بۆ هەموو جۆرە پێستێك یەکێك لەوانە پێستی وشك.

سودەکانی زەیتی گوێزی هندی بە نیسبەت پێستەوە هاوشێوەی زەیتە کانزاییەکانە وە لەوانیش زۆرتر. وە کەمی لە زەیتەکانی دیکە نەوەیە، کە هیچ پاشماوەیەکی خراپی نیە لەسەر پێست، لەگەڵ بەکارهێنانی زەیتی گوێزی هندی چارەسەرێکی بەکارە بۆ نەهێشتنی ووشکی و هەڵقلیشانی پێست وە هەروەها چرچ و لۆچ و پیری دوا دەخات، کە نەبێتە هۆی عادەتێکی روون و دیار لە کاتی پێشکەوتنی تەمەن، هەروەها یارمەتیدەرە لە چارەسەری ئەو کێشە جۆراوجۆرانەی پێست وەکو/ سەدەف، هەوکردنی پێست و ئەگزیما و هەوکرنە پێستییەکانی دیکە.. هەروەها زەیتی گوێزی هندی رەگەزێکی بنچینەیی پێك دێنێ لەو بەرووبومانەی کە بایەخ دەدات بە لەش وەکو/ سابون- یان ئەو بەکارهێنراوانە یاخود کرێمەکان.. هتد. کە بەکاردەهێنرێت بۆ بایەخ دان بە دەم و چاو.

٤- پیربوونی زووەخت/ زەیتی گوێزی هندی یارمەتی ئەدات بۆ رێگری کردن لە پیربوونی زوو، وە نەخۆشیە شۆربوونەوەی چاو لەکاتی زوودا( زووەخت) بە هۆی تایبەت مەندیەکانی دژە ئۆکسید.

٥-نەخۆشیەکانی دڵ/ لێرەدا هەندێك بیروباوەڕی هەڵە هەیە سەبارەت بە زەیت لە نێوان زۆر خەڵك کە دەڵێن زەیتی گوێزی هندی باش نیە بۆ دڵ چونکە پێك هاتووە لە رێژەیەکی زۆر لە چەوری تێربوو، لەگەڵ ئەوەشدا زەیتی گوێزی هندی باشە بۆ دڵ بێجگە لەوەش کرداری چالاکی خواردن زیاد دەکات و خاوەنی نزیکەی لەسەدا ٪٥٠ لە ترشی لوریکە و یارمەتی دەرە لە بەرگری کردن لە کێشە جیاوازەکانی دڵ وەك بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن و چەوریە تێرەکان کە لە زەیتی گوێزی هندی بێ زیانن و هەروەها لەگەڵ زەیتە رووەکییەکانی تردا کە نابێتە هۆی زیادبوونی رێژەی LDL هەروەها دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی رێژەی رووداوی توشبوون لە خوێن بەرەکان یارمەتی دەرە لە خۆپاراستن لە رەقبونی خوێنبەرەکان.

٦-لە دەست دانی کێش زەیتی گوێزی هندی زۆر بەسودە بۆ دانانی سنورێك بۆ کێش ئەو خاوەنی زنجیرەیەکە لە ترشەکانی چەوری کورت و ناوەند کە یارمەتی دەرە بۆ لەناوبردنی زیادەی کێش هەروەها هەرس کردن ئاسان دەکات و هەروەها یارمەتی چالاکییەکانی رژێنی دەرەقی دەدات بێجگە لەوەش کرداری چالاکی خواردن زیاد دەکات لە رێگەی لابردنی

پەستان لەسەر پەنکریاس وە هەروەها ووزە بەخشێکی باش و یارمەتی زیادەی کێش دەدات لەگەڵ قەلەوی و لێرەدا ئەو خەڵکانەی کە لە ناوچە إستوانیەکان دەژین رۆنی گوێزی هندی دەخۆن و زەیتی لێنراو هەموو ڕۆژێك ، ئەوانە بە دەست چەوری و قەلەوی کێشی زیادە نانالێنن.

٧-هەوکردنی پەنکریاس :زەیتی گوێزی هندی بەسوودە بۆ چارەسەری هەوکردنی پەنکریاس.

٨-هەرس کردن بە کارهێنانی ناوەوەی گوێزی هندی لە پلەی یەکەمدا زەیتی ئامادەکراو زەیتی گوێزی هندی یارمەتی چاکردنی کۆئەندامی هەرس دەدات هەروەها بەرگری دەکات لە کێشەکانی گەدە و کێشە جیاوازەکانی هەرس کردن و پێویستە بۆ رێك کردنی کۆڵۆنی دماری و چەوریە تێرەکان کە زەیتی گوێزی هندیا هەیە و چەند تایبە تمەندیەکی هەیە لە دژایەتی کردنی میکرۆب.

٩- یارمەتی دەرە لە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ جۆرە جیاوازەکان لە بەکتریا و قارچکەکان و مشەخۆرەکان و هتد. کە سەلامەتی هەرس کردن دەگرێتە خۆ زەیتی گوێزی هندی یارمەتی مژینی مادەی خۆراك بەخشی تر دەدات وەك/ ڤیتامینەکان و مادەکان و ترشە ئەمینییەکان

٩/ بەرگری کردن/ زەیتی گوێزی هندی باشە بۆ رێك خستنی بەرگری ,کۆئەندامی بەرگری بەهێز دەکات هەروەها چەوری و دژە میکرۆباتی تێدایە لەگەڵ ترشی لیۆریك، ترشی کابریك، بویلیك کە وا دادەنرێت دژە قارچکە و دژە میکرۆب و ڤایرۆسە لەشی مرۆڤ ترشی لۆریك دەگۆڕێت بۆ مونولورین کە یارمەتی هەلسوکەوت کردن لەگەڵ ڤایرۆس و بەکتریا و توش کەرەکانی نەخۆشی وەك/ ئەنفلونزا و ڤایرۆسی گەورەی خانەکان و ڤایرۆسی کەمی بەرگری مرۆیی دەدات.

وە یارمەتی بەرەنگاربوونەوەی بەکتریای زیان بەخشی وەك/ ستریا و هیلیکوباکتر بیلوری بر و توزوا زیان بەخشن وەك جیاردا مبلیە.

١٠-چارەسەر بوون کاتێك بەکاردەهێنرێت دژی نەخۆشی کە چینێکی کیمیایی دروست دەبێت لە دەوری ئەندامێکی لەشمان کە تووشی بووە بە توزی دەرەکی و لە هەوادا و بەکتریا

قارچکەکان و ڤایرۆسەکان بۆیە زەیتی گوێز پارێزگاری لەو ئەندامە دەکات زەیتی گوێزی هندی باشترین کاریگەری هەیە لەسەر پاشماوەکان بە هۆی کرداری چارەسەر لە ڕێگەی چاکسازی انسجەی لەناوچوو.

١١- هەوکردن، زەیتی گوێزی هیندی زۆر کاریگەرە دژی کۆمەڵە جۆراوجۆرەکان دژە قارچکە دژە میکرۆبە دژە ڤایرۆسە هەروەها کاریگەرە لەسەر قارچکەکان و ترشاندن و بکوژی فایرۆسە لەگەڵ ئەنفلۆنزا و سوورێژە و هەوکردنی جگەر و نەخۆشی سارس هەروەها بکوژی بەکتریایە کە دەبێتە خۆی هەوکردنی قورگ و بۆری میزەڵدان و بۆری هەناسە هەروەها کاریگەرە لە دژی قارچکەکان و ترشەکان کە دەبنە هۆی نەخۆشی هێلکەدان.



١٢-جگەر/ بونی زنجیرەیەکی چەوری سیانی ناوەند وە ترشی چەوری یارمەتی دەدات بۆ پارێزگاری کردن لە نەخۆشیەکانی جگەر، کاتێك کە ئەم مادانە دەگۆڕێت بۆ ووزەی ئاسان کە بۆ جگەر دەڕوان هەروەها نەهێشتنی کۆبونەوەی چەوری.

٣-گورچیلەکان/ زەیتی گوێزی هیندی یارمەتی دەرە بۆ پارێزگاری کردن لە زیانەکانی ناو گورچیلە و بۆرییەکان هەروەها یارمەتی چارەسەری بەردی گورچیلە دەدات

٤-نەخۆشی شەکرە/ زەیتی گوێزی هیندی یارمەتی دەرە لە دەست گرتن بەسەر ئاستەکانی شەکر لە خوێندا وە چاکتر دەردانی ئەنسۆلین.

١٥-ئێسکەکان/ زەیتی گوێزی هیندی هێزی لەش بۆ مژینی کانزا چاکەکان و کە کالیسۆم و مەگنسیۆم دەگرێتەوە زیاد دەکات کە ئەمانەش گرنگن بۆ گەشەی ئێسك هەروەها ڕۆنی گوێزی هیندی بەسوودە بۆ ئەو ژنانەی کە توشی پوکانەوەی ئێسك دەبن دوای نیوەی

**تەمەنیان**

**١٦-بایەخ دان بە ددان/ کالسیۆم رەگەزێکی گرنگە سەبارەت بە ددان، زەیتی گوێزی هیندی مژینی کالسیۆم ئاسان دەکات لە لەشدا وە هەروەها یارمەتی بەهێزبوونی ددانەکان دەکات.**

**وە رۆن زەیتی هیندی پوکانەوەی ( خوران )ی ددانەکان لەناو دەبات**

**١٧-ڤایرۆسی کەمی بەرگری لەش وە نەخۆشی شێرپەنجە/ وا دادەنرێت کە رۆنی گوێزی هیندی رۆنێکی چالاك دەگیرێت دژی ئەو ڤایرۆسانە، لە کاتی نەخۆشی لای ئەوانەی کە دەنالێنن بە دەست ڤایرۆسی کەمی بەرگری لەش و نەخۆشی شێرپەنجەوە.**

**لێرەدا وا دەرکەوتووە هەندێك ئاراستە لە کاریگەری گوێزی هیندی بۆ کەم کردنەوەی هەلگرتنی ڤایرۆسی نەخۆشیی کەمیی بەرگری.**

**پێکهاتەی گوێزی هندی لە ١٠٠ گرام:**

**السعرات الحراریه: ٣٥٩**

**کالسیۆم: ٢١ ملگ**

**پرۆتین: ٣،٤ ز**

**فۆسفور: ٩٨ ملگ**

**ئاسن: ٢،٠ ملگ**

**کاربۆهیدرات: ١٤ گرام**

**فیتامین B: الپیامین ٠،١٠ میلگرام**

**فیتامین C: ٢ ملگ.**

**چەوری: ٣٤،٧ گ**

Kokum کۆکوم



ئەمیش میوەیەکە کە خاوەنی تایبە تمەندی زۆرە و بەسوودە بۆ تەندروستی. بە شێوەیەکی زۆر لە وڵاتی هیند دەڕوێنرێت. وە زانراویشە کە Kokum بە شێوەیەکی زۆر لە دروست کردنی خواردنەوە بژوێنەرەوەکاندا بەکاردەهێنرێت. میوەی Kokum خاوەنی بڕێکی زۆر تایبە تمەندی تەندروستییە.

سوودە تەندروستییەکانی Kokum کۆکوم:

زۆرانەی کە لە شەربەتی Kokum دا هەیە.

توێکلی Kokum بەرزترین ڕێژە لە مادەی (گانثونیس) ی تێدایە. هەروەها ناخی Kokum

واتە بەرەکەی بە یەکێك لە باشترین میوەکان دادەنرێت لە جیهان دا.

١-میوەی Kokum بڕێك لەو مادانە دەگرێتە خۆی کە دژی ئۆکسیدەکانە کە ڕەگە ئازادەکانی خانەکانی لاشە پێکەوە دەبەستنەوە. هەروەها خانەکانیش بەهێزتر دەکات.

٢-شەربەتی Kokum خاوەنی ناوبانگێکی زۆرە بە تایبەتی لە مانگەکانی هاوینی گەرمدا چونکە لاشە سارد دەکاتەوە، وە لاشەش دەپارێزێت دژی ووشك بوونەوە و لێدانی خۆر. هەروەها یارمەتیدەرە لە کەمکردنەوەی تا و حەساسیەت.

٣-تۆوەکانی Kokum بڕێکی زۆر لە زەیتی تێدایە . وە زەیتی **Kokum** لە بوارەکانی دروست کردنی دەرمانەکان و مادەکانی جوانکاری دا بەکاردێت لە سنوورێکی بەرفراوان دا کە ئەمەش کاریگەرییەکی بەهێزی هەیە لەسەر پێستی قلیشاو و وشك بوو، یان ئەو پێستانەی بەر گەرمایی خۆر دەکەوێت و توشی حەساسیەت دەبێت.

٤-ڕۆنی Kokum خاوەنی نازناوێکی بەرزە ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ ڕۆنی کاکاو لەبەر ئەوەی پێست بە تەڕی دەهێڵێتەوە.

٥-هەروەها خاوەن تایبەتمەندی ترە لەوانە توانای چارەسەرکردنی، یاخود بەکارهێنانی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەسەر ناوچەی تووش بوو یان بۆ برینەکان.

٦-ڕۆنی Kokum

دەوڵەمەندە بە ڕۆنە تەندروستەکان، وەك ترشی ڕۆنی و ترشی ئۆلیك، و هەروەها دەتوانرێت وەك زەیتی خۆراك بەکاربهێنرێت.

٧-وە میوەی Kokum بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی قورسی هەزم کردن گەدە وەك ترشێتییەکەی، وە چارەسەری ئاوسانی سك و نەهێشتنی گیربوون( قەبزی ).

٨-شەربەتی Kokum

باشترینە بە بەراوردکردنی لەگەڵ خواردنەوە شووشەییە بازرگانییەکان. وە هەروەها بەکاردێت بۆ چالاك کردنی شەهیەت و نەهێشتنی بەد خۆراکی و دژی کرمیش کاردەکات.

٩-Kokum بەکارهاتوە لە هیندی کۆن بۆ چارەسەر کردنی ئیلتیهابات، وە شتێکی زانراویشە کە میوەی Kokum توانایەکی زۆری هەیە بۆ بەهێز کردنی کاری دڵ و خوێن بەرەکان و و جگەر.

١٠-لە میوەکەیدا ترشی ( الهیدروکسی ستریك ) هەیە کە دەست دەگرێت بەسەر کۆلیسترۆڵ دا، بەوەش یارمەتی کەمکردنەوەی کێش دەدات.

## زیره



زیــره بــۆ یه‌كــه مجار لــه ناوچــه‌ی ده‌ریــای ســپی ناوه‌راســت دۆزرایــه‌وه، تۆوه‌كــانی رازیانــه به‌ناوبانگــه بــه تامــه خۆشــه‌كه‌ی، وه ئێــستا بــه نزیكــه‌یی لــه هــه‌موو ناوچه‌كانی جیهــان دا گه‌شــه ده‌كات.

وه سوود ده‌بینرێت له تۆوه‌كانی زیره له زۆر وڵاتدا وه‌ك گیایه‌كی سوود به‌خش.

وه به گیایه‌كی ساڵانه‌یی داده‌نرێت ، كه بۆنێكی به‌هێزی هه‌یه ، وه له‌گه‌ڵ خواردنه‌كانـدا به‌كارده‌هێنرێت بۆ زیادكردنی تامی خۆش .

زیره ده‌گه‌رێته‌وه بۆ خێزانی مه‌عده‌نوس، به‌ری زیره ده‌وڵه‌مه‌ندترین سه‌رچاوه‌یه بۆ مـاده‌ی الثیمول ، وه زۆر زۆر باشه بـۆ نه‌هێشتنی پـه‌تا. ئـه‌م تۆوانـه سوودمان پێده‌به‌خشێت بـۆ مه‌به‌ستی ته‌ندروستی، به‌راستی ئێمه پێویستمان به تۆوی زیره هه‌یه له ژیا نماندا.

مه‌تبه‌خه‌كانی ئیندنوسیا و هیند قه‌ت ده‌ست به‌رداری ئه‌و تۆوانه نـابن، نـه‌ك تـه‌نها لـه‌و ده‌وڵه‌تانه‌دا به‌ڵكو له سنوورێكی به‌رفراوانیش دا له‌ناو وڵاتان دا به‌كاردێت.

**سووده تەندروستییەکانی زیره:**

**١-بەهێزکردنی سیستەمی بەرگری.** دژه ئۆکسیدێکی بەهێزه وه دەبێته هۆی بەهێزکردنی بەرگری سروشتی.

**٢- پارێزگاری لە خوێن دەکات.** زۆر دەوڵەمەندە بە ئاسن، ئەمەش وای لێدەکات کە بەکارهێنانی ببێتە هۆی تەواو کردنی سروشتی تەندروستی خوێن و چارەسەرێکیش بێت بۆ چارەسەر کردنی کەم خوێنی. لە کاتی زۆر بوونی رێژەی ئاسن لە خوێن دا دەبێتە هۆی زیادبوونی هیمۆگلۆبین ، وە مادەکانی هەڵگری ئۆکسجین لە هەموو خانەکان لەشدا زیاد دەکات.

**٣- پێش لەدایك بوون .** پشتگیری لە گەشە پێدانی تەندروستی دەکات پێش منداڵ بوون لە لای ئافرەتە سك پڕەکان. ئەمە وا دەکات منداڵ بوون ئاسان تر بێت، وه دروست کردنی شیریش باشتر دەکات لە لای دایکە شیر دەرەکان. لەبەر ئەوەی زۆر دەوڵەمەندە بە ئاسن ، هەروەها گیای زیره تەندروستە بۆ ژنان لە هەموو تەمەنەکانیدا لە کاتی سووڕی مانگانەدا.

**٤-نەخەوتن.** چارەسەرێکی کارایە بۆ نەخەوتن. تۆوەکانی شان بە شان لەگەڵ مۆزێکی پێگەیشتوو بەکاردێن و پێش خەوتن بەکاردێن بۆ هاندانی مرۆڤەکە بۆ خەوتن.

**٥-لە بیرچوونەوە.** زاکیره و ئەرکە گشتییەکانی مێشك بەهێز دەکات، وه چارەسەرێکی خێرایە بۆ نەخۆشی لەبیرچوونەوە.

**٦-هەرس کردن.** تۆوەکانی کاری هەرس کردن باشتر دەکات و ئازارەکانی کارکردنی هەرس کە باون کەمدەکاتەوە، لەوانە ئاوسانی سك ( غازات ) ، و ئاوسان و مەیاسیری و گیربوون ( قەبزی ) و ڕشانەوە. وەك یارمەتیدەرێك بەکاردێت بۆ هەرس کردن لە ڕێگەی هاندانی دروست کردنی رژێنی پەنکریاس.

**٧-شێرپەنجە.** یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی بەکارهێنانی زیره بۆ چارەسەرکردنی شێرپەنجەیە. وه دەبێتە هۆی خاو کردنەوەی گەشەی شێرپەنجەی مەمك و خانەکانی شێرپەنجەی قۆڵۆن.

**٨-سەرمابوون و نەخۆشیەکانی کۆئەندامی هەناسەدان.** لە تۆوەکانی مادەیەك

دەردەهێنرێت بۆ چارەسەرکردنی سەرمابوون و تا و هەناسەت و ئازارەکانی قوڕگ.

٩-تەندروستی گورچیلە، لە کاتی تێکەڵ کردنی لەگەڵ خوێ، زیرە ی خڕی ڕەش چارەسەرێکی کارایە بۆ ئازارەکانی گورچیلە.

١٠-تەندروستی دروست کردن و تێکدانەوەی خانەکان. ئەم کارە زیاد دەکات، وە دەبێتە هاندەرێك بۆ مژینی مادە خۆراکیەکان لە هەموو ناوچەکانی لەش دا. ئەو کەسانەی کە زۆر بەکاری دەهێنن ئەوە بەدی دەکەن کە زیرە یەکێکە لە باشترین بەهێزکەرە سروشتییەکانی هەموو بەشەکانی لەش.

**خەیار**



**خـــــەیار بـــــەکاردێت وەك تەواوکـــەرێك بـــۆ خواردنـــەکان. یەکێك لە سوودەکانی تری خەیار پـــشتگیری تەندروســـتییە، وە دەکرێت خەیار بەکاربهێنرێت لـە مادەکانی جوانکاری دا.**

**خـــەیار بڕێکـــی زۆر لـــە ڤیتامینەکانی C, B٢, B١, A لە خۆ دەگرێت. جگە لە هەندێ مادەی پڕ خۆراکی تر وەك کاربۆهیدرات و پرۆتینەکان و ڕۆنەکان و تاووزەی گەرمی ( وزە ). وە مادەی تر لە کانزاکـان وەك فـسفۆڕ و ئاسـن و مەگنـسیۆم و کالـسیۆم و پۆتاسـیۆم. هـەروەها خـەیار ترشـەکانی المالونیك و الیافیشی تێدایە، کە زۆر سوودبەخشە بۆ لاشە. خـەیار یەکێکە لـەو میوانـەی کە بڕێکی زۆر ئاوی تێدایە. وە خواردنی میوە زۆر باشە وەك دەستپێشخەری بـۆ میـز کـردن. بڕی ئاو لە خەیاردا زۆر زۆر باشە بۆ پاك کردنەوەی بەکتریا خرا پەکان لـە لاشـەدا. بـەڵکو توانای ئەوەی هەیە کە ئەو زەهرانە لەناو بەرێت کە دەچنە ناو لاشەوە. تۆوەکـانی خـەیار ئەو مادانەی تێدایە کە دژی ژەهرەکانن، وە تێبینی کراوە کە دەتوانرێت بەکاربهێنرێت بـۆ نەهێشتنی کرم لە منداڵدا.**

**خەیار لـە حاڵەتـەکانی بەرزبوونـەوەی پەسـتانی خـوێن دا بـەکاردێت؛ وە لەوانەیـە ئـەم ڕاستیەمان بەرگوێ بکەوێت لەناو خەڵکیدا بە شێوەیەکی زۆر.**

**خەیار فۆسفۆر و پۆتاسیۆم و مەگنسیۆم بە ڕێژەیەکی زۆر لە خۆ دەگرێت، ئەوەش لەوانەیـە ببێتە هۆی کەم کردنەوەی بەرز بوونەوەی پەستانی خوێن. بە نیـسبەت ئـەو کەسـانەی کـە شوێنی سیستەمی خۆراکی دەکـەون، بـەری خـەیار باشـە و بڕێکـی کـەم تـاووزەی تێدایـە و ڕیشاڵیشی تیدایـە، ئـەوەش شـتێکی زۆر باشـە بـۆ پارێزگـاری کـردن لـە کێـشت. لەگـەڵ ئەوەشدا، ترشی مالونیك کە لە خەیار دا هەیە سوودی زۆرە بۆ پارێزگـاری کـردن لـە پلـەی شەکر لە خوێن دا. وە لە سوودەکانی تری خـەیار دەتوانرێـت وەك چارەسـەر بـەکاربهێنرێت**

دژی گرێی ناو پێست، وەك ئەو گرێ یانەی دروست دەبن لە کاتی پێوەدانی مێروودا، وە بۆ رزگاربوون لەوە پارچەیەك خەیار بهێنە و بەو شوێنەی دا بێنە کە ئاوساوە لە پێستەکە. وە لەگەڵ ئەو سودانەی کە بۆ لاشە هەیەتی هەروەها خەیار سودێکی زۆری هەیە بۆ پێستی دەم و چاو، دەبێتە هۆی بووژانەوە و لەناوبردنی چرچ و لۆچیەکان بە ئاسانی. دەتوانرێت لە خەیار گیراوەیەك دروست بکرێت بۆ لەناوبردنی مێرووەکان، لە رێگەی رشتنی ئەو گیراوەیە لەو شوێنانەی کە سیسرکی تێدایە.

سوودە تەندروستییەکانی خەیار:

١- پەستانی خوێن. خەیار کانزاکانی صۆدیۆمی تێدایە کە ئەویش یارمەتی دەرە بۆ رێخستنی پەستانی خوێن.

٢-سوودی هەیە بۆ سەرئێشە. خەیار گرنگە بۆ نەهێشتنی سەر ئێشە. پێش چوونە ناو جێگە لەتێك خەیار بخۆ چونکە یارمەتیدەرە بۆ خەوێکی ئارام و هەستان لەخەو بەبێ ئیزعاج بوون و بە بێ تووش بوون بە سەر ئێشە.

٣-هەموو ڤیتامینەکان لە خۆ دەگرێت. خەیار گشت ڤیتامینە جیاوازەکان لە خۆ دەگرێت کە هەموو رۆژێك پێویستت پێیەتی. ڤیتامین B١,B٢ و ڤیتامین B٣، و ترشی فولیك و ڤیتامین C و کالسیۆم و ئاسن و مەگنسیۆم و پۆتاسیۆم و زەنك لە خۆدەگرێت.

٤-رێکخەرێکی خۆراکی یەکسانە. خەیار برێکی باشی لە ڤیتامین B و شەکر تێدایە، کە گرنگن بۆ بەرهەم هێنانی ئەو پێکهاتە خۆراکیە گرنگانەی کە لەناودەچن لە لەشدا.

٥- پارێزگاری کردن لە پێکهاتەکان. خەیار پارێزگاری دەکات لە بری کۆلاجین لە پێستدا، وە دەبێتە زیاد بوونی پارچەی دەرمەوەی ، وە بەشداری دەکات لە کەم کردنەوەی دەرکەوتنی حەساسیەتی پێکهاتەکان. بەکارهێنانی پارچەیەك یان دوو پارچە لە خەیار بۆ سووانی ئەو ناوچانەی کە تووشی حەساسیەت بوون بۆ چەند دەقیقەیەك.

٦-خۆراکێکی تەندروستە. دەکرێت تەنها یەك خەیار بەکاربهێنیت بۆ خواردنە خێراکان و برسێتی لەناو ببەیت.

٧-بۆنی دەم. بۆ لەناوبردنی بۆنی ناخۆشی دەم پارچەیەك خەیار ببە و پەستان بخەرە

سەری لە ڕێگەی شەویلگەی سەرەوە لەگەڵ زمانت دا بۆ ماوەی ١٥-٢٠ چرکە.

٨-چالاك کردنی قژ. شەربەتی خەیار و سپێناخ یاخود تێکەڵ کراو لەگەڵ گێزەر دا سودی هەیە بۆ زیاد کردنی گەشەکردنی قژ.

٩-سودبەخشە بۆ چاوەکان. ڕاکشان و پاشان دانانی دوو پارچە لە خەیار لەسەر چاوەکان بۆ ماوەی ١٠ دەقیقە شتێکی زۆر چاکە. ئاوسانی چاوەکانیش کەم دەکاتەوە.

١٠-جوانی سروشتی. پێکهاتە جوانکارییە سروشتییەکان سودێکی زۆر زیاتریان هەیە بۆ پێست وەك لە پێکهاتە جوانکارییە کیمیاییەکان.

١.لەناوبردنی زیپکە. دانانی خەیاری پارچە کراو لەسەر دەم و چاو و مل بۆ ماوەی ١٥-٢٠ دەقە، وەك چالاك کەرەوەیەکی زۆر باش کار دەکات. بەکارهێنانی ڕێك و پێك دەبێتە دوور کەوتنەوە لە زیپکە و سەرە ڕەشەکان و ووشك بوونەوەی دەم و چاو.

٢.زیاد کردنی برێك لە شەربەتی لیمۆ و ئاوی گوڵ بۆ شەربەتی خەیار، وە بەکارهێنانی لەسەر پێستی دەم و چاو بۆ دەست کەوتنی رووکارێکی رووناك و زیاتر بریقەدار.

٣-خەیار باشە بۆ حەساسیەتی قوڕگ. غەرغەرە کردن بە شەربەتی خەیاری تازە چەند جارێك لە ڕۆژێك دا.

٤-خەیار نەرم کەرەوەیە. خەیار نەرم کەرەوەیەکی سووك لە خۆ دەگرێت، جوڵێنەری میزە و چارەسەری ترشی مەعیدەیە. یارمەتی پاك کردنەوەی مەعیدە دەدات و دەرچوونی میزیش زیاد دەکات.

٥.خەیار کارایە بۆ لە ناوبردنی ئاوسانی چاو و هیلاکی کە لە ئە نجامی هەوای خێرا و پڕ خۆڵەوە تووشی دەبین، وە هەروەها لە تیشکە تیژەکان و بەکارهێنانی عەدەسەوە بۆ کاتێکی زۆر توشی دەبین ، وە زۆر جار کاتێك چاوەکا نمان دەئاوسێن ئازاری زۆر دەبێت و دەخورێت.

٦-خەیار باشە بۆ دەست کەوتنی ڕوویەکی بریقەدار. گیراوەیەك دروست بکە بە بڕی یەکسان لە شەربەتی خەیار و شیر لەگەڵ چەند دڵۆپێك لە ئاوی گوڵ، پاشان لەسەر دەم و چاوی دابنێ بۆ ماوەی ١٥-٢٠ دەقە، ئەمەش وا لە دەم و چاوە حەساسەکە دەکات کە نەرم و سەرنج ڕاکێش بێت. وە ئەم پێکهاتەیە دەبێتە هۆی سپی بوونەوەی دەم و چاویش.

٧-خەیار بە شێوەیەکی باش کار دەکات بۆ لابردنی ئەو بازنە ڕەشانەی کە لە خواری چاوەوە دروست دەبن. یەك کەوچکی بچوك لە شەربەتی پەتاتە بکەرە ناو ١ کەوچکی بچوك لە شەربەتی خەیار. بەکاری بێنە لەسەر ئەو پێستەی کە لە دەوروبەری چاوەکانتە. پاشان ڕاکشێ بۆ ماوەی ١٥ دەقە. زۆر کارایە بۆ لابردنی ئەو پەڵە ڕەشانەی لە دەوروبەری چاوەکانت دروست دەبن..

٨-خەیار لە نەرم کردنەوەی پێست دا. تێکەڵ کردنی شەربەتێك لە لیمۆ و خەیار و پرتەقاڵ لەگەڵ بڕێکی یەکسان لە شلەی جلسرین و هەنگوین، ئەمە لەبەر نەرم کردنی پێست.

٩-خەیار چاکە بۆ گەشەکردنی قژ. تێکەڵ کردنی خەیار و گێزەر هانی گەشەکردنی قژ دەدات. خەیار خۆراك دەداتە قژ و نینۆکەکان و پێست لەبەر ئەوەی بڕێکی زۆر لە سلیکۆن و کبریتی تێدایە.

١٠-خەیار ئەو مەترسیانە کەم دەکاتەوە کە بە هۆی مەلەکردنەوە توشی قژ دەبێت. لەوانەیە مەلە کردن لە ناوێکدا کە بڕێك کلۆری تێدایە زیانی زۆر بە قژت دەگەیەنێت.
١ هێلکە تێکەڵ بکە ، لەگەڵ ٣-٤ کەوچکی گەورە لە زەیتی زەیتون و ١/٤ خەیاری پاك کراو. پاشان ئەم تێکەڵەیە بە یەکسانی لە سەر قژت بڵاو بکەرەوە ، وە وازی لێ بێنە بۆ ماوەی ١٠ دەقە پاشان بە باشی لایدە.

١١-خەیار باشە بۆ چارەسەر کردنی زیپکە. ئامادەکردنی گیراوەیەك کە بڕی یەکسانی تێدا بێت لە شەربەتی خەیار و ئاو و کهول ٧٠٪ بۆ چارەسەرکردنی پەڵە ڕەشەکان و پەڵە ناشرینەکان کە لە ئەنجامی مێش و مەگەز و پێوەدانی مێرووەکانەوە دروست دەبن.

پێكهاته‌ی خه‌یار له‌ ١٠٠ گرام:

كالسیۆم: ٢٠ ملگ

پرۆتین: ٠,٧ گرام

ئاسن: ١,١ ملگ

كیلۆ كالۆری: ١٢

كاربۆهیدرات: ١.٣ گرام

سۆدیۆم: ٢ ملگ

ماده‌ ریشاڵیه‌كان: ٠,٦ گرام

فیتامین C: ٤ ملگ

## شێلم



شێلم بەکاردێت بۆ لەناوبردنی مادە کیمیاییە ژەهراوییەکان ( وەك DDT و پەترۆڵ و یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن ) ، وە پیس بوونی ژینگەیی یاخود کانزا قورسەکان ( وەك رەساس و زئبەق و کادمیۆم ) .

سووده تەندروستییەکانی شێلم :

١-باشە بۆ جگەرە کێشەکان.

٢-بۆ ئەو کەسانەی کە قەلەقن کێشەی دەرونیان هەیە .

٣-بۆ ئەو کەسانەی کە مەشروب خۆرن .

٤- بۆ ئەو کەسانەی کە هەندێ خواردنیان پێ ناکەوێت .

٥- بۆ ئەو کەسانەی کە توشی نەخۆشی پەتا ولەم نەخۆشیانەی تر .

٦- ئەگەر بێت و ئەنتی پێوتیکا وە یان ئەسپرین وە یان حە پە ئازار برینەکانی تر بخۆیت.

٧- بۆ ئەو کەسانەی کە هەوکردنی بێزارکەرەیان هەیە.

٨- بۆ ئەو ئافرەتانەی کە حەپ بەکار ئەهێنن ( منع ) .

٩- بۆ ئەو کەسە پیرانەی کە لەسەروی ٦٠ ساڵەوەن .

پێکهاتەی شێلم لە ١٠٠ گرام:

کیلۆ کالۆری ٨٦

حمج الفولیك / حامج الفولیك ٢١ میکروغرام

شەکر: ٨،١٣ گرام

مادە ریشاڵیەکان: ٢,٥ گرام

ڤیتامین C : ٢٥-٣٠ ملگ

ئاو ٨٩،٦٦ گرام

## شێلمی سپی



کەلەرم بە سەرچاوەیەکی چاکی ڤیتامین ( ج ) دادەنرێت، کە یارمەتی لاشە دەدات بۆ مژینی ئاسن. وە ئاسن ئۆکسجین زیاد دەکات لە خڕۆکە سوورەکانی خوێن دا، بەوەش وزە زیاد دەکات. نیو کوپ لە کەلەرم ٢٤٥ ملیگرام لە پۆتاسیۆم لەخۆ دەگرێت، ٢٥ یەکە لە ڤیتامین A، ٤,٤٣ ملیگرام لە ڤیتامین C و ١١,٣ میکرۆگرام لە ترشی فولیك، و ١٦,٨ ملیگرام لە کالسیۆم و نزیکەی ١٠ گرام لە مادەی کۆلین . کەلەرم بڕێك لە ڤیتامین Cی تێدایە . ئەویش یارمەتیدەرە بۆ پارێزگاری کردن لە شێوە و ڕێکی ئێسکەکان، و کۆئەندامی هەرس کردن و سیستەمی لیمفاوی. کەلەرم سووری خوێن باشتر دەکات و تەڕی لاشەش کەم دەکاتەوە. چونکە یارمەتی جێگیر بوونی پلەی شەکر دەدات لە خوێن دا، وە بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی شەکرە. کەلەرم مەترسی تووش بوون بە گریێ لە ( الصفن ) کەم دەکاتەوە. وە سەرچاوەیەکی زۆر باشە بۆ ڤیتامین Cو پۆتاسیۆم . بڕێکی زۆر لە ریشاڵی تێدایە ، وە بڕێکی کەم تاووزەی تێدایە. خواردنی سەوزەوات بە تایبەتی کەلەرم کە دەوڵەمەندە بە ڤیتامین ( ج ) یارمەتی دروست کردنی ئێسکەکان دەدات ، وە یارمەتی ودیلە خوێنەکان و لیمفەکان و سیستەمی هەرس کردن دەدات لە لاشەدا. وە لەوانەیە کەم بوونەوەی ئەم ڤیتامینە لە لەش دا ببێتە هۆی پیاکێشان و ئێسکە پوت ، بڕێکی زۆر لە پۆتاسیۆم لە خۆدەگرێت کە ئەمیش مەترسیەکانی بەردی گورچیلە کەم دەکاتەوە، و کەم کردنەوەی پەستانی خوێن . لە کوپێك کەلەرم دا نزیکەی ٣٦ تاووزەی تێدایە و ٥ گرامیش لە ریشاڵەکان. وە سەرچاوەیەکی زۆر باشیشە بۆ ڤیتامین C و سەرچاوەیەکی باشە بۆ پۆتاسیۆم. کەلەرم مادە کیمیاییە ڕووەکییە گرنگەکان لە خۆدەگرێت وەك اندولات، ثیوسیانات، وا دادەنرێت کە اندولات گرنگ بێت بۆ دژایەتی کردنی شێرپەنجەی ( مجمع ). کە لە سەوزەواتەکانی تردا هەیە وەك قەرنابیت ، وە خونچەی بروکسل و قەرنابیت و مەلفوف. زیاد کردنی سوورکردنەوەی اندولات دەبێتە زیادبوونی چالاکی سوورکردنەوەکە. سەرچاوەیەکی باشە بۆ ڤیتامینەکان و مەگنسیۆم B و کانزاکانی تر کە بە گرنگ دادەنرێت بۆ جێگیر بوونی پەستانی خوێن. مەگنسیۆم بەهەمان شێوە گرنگە بۆ تەندروستی دڵ و بەهێزکردنی ئێسکەکان.

**سوودە تەندروستییەکانی شێلمی سپی :**

١-کاکڵە ئاوییەکەی بڕێکی کەم لە ڤیتامین ( أ ) و کارۆتینی تێدایە.

٢-بەشێوەیەکی تایبەتی، بڕێکی باش لە کانزاکان لە خۆدەگرێت، وەك مس و کالسیۆم و مەنگەنیز و بۆتاسیۆم و فسفۆر. پۆتاسیۆم پێکهاتەیەکی گرنگە بەنیسبەت شلەکانی خانەکان و لاشە، و ڕێژەی لێدانەکانی دڵ و پەستانی خوێن، وە کاردەکات بۆ بەرەنگاربوونەوەی کاریگەرییەکانی صۆدیۆم.

٣-کەلەرم شان بە شانی میوەکانی تر بەکاردێت کە مادە کیمیاییە رووەکییە زیادکەرەکان بۆ تەندروستی لە خۆ دەگرێت، وەك ڤیوسیانات، و ئەندول ، کە ئەمیش یارمەتیدەرە بۆ پارێزگاری کردن لە شێرپە نجەی کۆڵۆن و پرۆستات.

٤-قاچ. بڕێکی باش لە کۆمەڵە خۆگرتووەکان لە ڤیتامینەکانی وەك النیاسین لە خۆ دەگرێت، وە ڤیتامین B٦ و ثیامین و ترشی البانتوثنیك ، کە ئەمیش بە کارتێکەرێکی گرنگ دادەنرێت کە لاشە پشتی پێدەبەستێت لە کرداری تەمسیلی خۆراکی.

٥-ڕەگی کەلەرمی تازە دەوڵەمەندە بە ڤیتامین ( ج )، وە دەتوانرێت لە هەر لە ١٠٠ گرام لە کێشی ڕەگ ٦٢ گرامی تەواو دەربهێنرێت، کە دەکاتە ١٠٢٪ لە RDA. لەگەڵ ئەوەی کە دەوڵەمەندە بە ڤیتامین C کە لە ئاودا دەتوێتەوە و یەکێکە لە دژەکانی ئۆکسیدە بەهێزەکان. کە یارمەتی لاشە و پێکهاتەکان و ددانەکان دەدات و پارێزگاری لە تەندروستی پوکەکانیش دەکات.

وە لە تایبە تمەندییەکانی تری ڕەگەکەی ئەوەیە کە دژە ئۆکسیدە و یارمەتی لاشە دەدات لە بەرەنگاربوونەوەی نەخۆشیەکان و پاراستن لە شێرپە نجە.

**پێکهاتەی شێلمی سپی لە ١٠٠ گرام:**

کاربۆهیدرات: ٦,٢ ز

شەکر: ٢,٦ ز

مادە ڕیشاڵیەکان :٢,٦ جم

چەوری: ٠,١ گ

پرۆتین: ١,٧ گرام

٩١ غ ماو

ڤیتامین C : ٦٢ ملگ

## مەعدەنوس



مەعدەنوس سوودی تەندروستی هەیە لەوانە بۆ چارەسەرکردنی وەرەم (گرێ)، وە بەرزبوونەوەی کۆلیسترۆلی خوێن، و زەحیری و قورحەی دەم ، و کەم خوێنی و قورسی هەرس کردن ، و تێکچوونەکانی سووڕی مانگانە، و ئاوڵە و، کێشەکانی چاو ، و تێکچوونەکانی پێست و تێکچوونەکانی خوێن. مەعدەنوس بە شێوەیەکی چڕ هەیە لە کیشوەری هیندی، و لە ئەمەریکا و بەشێکی ئەوروپا، وە لەو سەوزانە دەژمێردرێت کە بە شێوەیەکی بەرفراوان لە گشت وڵاتان دا بەکاردێت وەك سەوزەیەکی سەرەکی لەسەر مێزی خواردن. گەڵا و بەری مەعدەنوس تامێکی نموونەیی لە خۆ دەگرێت. مەعدەنوس تەڕ یاخود ووشك لە چێشت خانەکان دا بەکاردێت بۆ ئەوەی تام و چێژ ببەخشێتە خواردنەکە. وە مەعدەنوس بڕێکی زیاتر تایبە تمەندی هەیە کە دەتوانرێت چەند کتێبێکی لەسەر دابنرێت. وە یانزە زەیتی بۆنی لێدەردەهێنرێت، وە شەش جۆر لە ترش ( لەوانە ترشی الاسکوربیك ، کە ناسراوە بە ڤیتامین ( ج ) ) و کانزاکان و ڤیتامینەکان کە هەریەکەیان چەند تایبە تمەندییەك لە خۆ دەگرێت.

سووده تەندروستییەکانی مەعدەنوس:

١-لە وەرەمەکان( گرێکان ) . یەکێك لە پێکهێنەرەکانی یانزە زەیتە سەرەکییەکە بە سینول ناسراوە، وە ترشی اللينوليكيش لە خۆ دەگرێت، کە خاوەنی تایبە تمەندی دژایەتی کردنی رۆماتیزم و دژی حەساسیەتی جومگەکانیشە، بەڵام ئەو کەسانەی کە دەناڵێنن بەدەست دروست بوونی گرێ وە بە هۆی بوونی کێشە لە گورچیلە یان بەهۆی کەمی خوێنەوە مەعدەنوس بە چارەسەرێکی باش دادەنرێت بۆیان.

٢-بەرزبوونەوەی کۆلیسترۆڵ لە خوێن دا. لە کەرەوزدا هەندێك ترش هەیە، لەوانە ترشی اللينوليك و ترشی نوليك و ترشی بالمتيك و ترشی رۆناوی و ترشی سکوربیك ( ڤیتامین C )، کە یارمەتی دەرن بۆ کەم کردنەوەی کۆلیسترۆڵ لە خوێن دا. هەروەها دەبێتە کەم

کردنـەوەی مانـەوە و لکـانی کۆلیـسترۆڵ بـە دریـژایی دیوارەکـانی نـاوەوەی خـوێن بـەر و دەمارەکان.

٣-زەحیری. لە نـاو هەنـدێك لـە زەیتـە سـەرەکییەکانی مەعـدەنـوس دا مـادەی بورنیـول و لینـالول کـە کاریگەرییـەکی چـاکیان هەیـە لەسـەر کۆئەنـدامی هـەرس و جگـەر. وە یارمەتیدەرە بۆ چارەسەرکردنی زەحیری. وە سوودبەخشە بۆ ئەو سکچونەی کە لـە دوژمـنی میکرۆبـی و کـەرووەوە دروست دەبێـت. پێکهاتـەکان وەك سـینول و برونیـول و لیمـونین ، فـابینین کاریگـەری هەیـە لـە دژی ڤـایرۆسـەکانی بیتـا-فلانـدرین. وە لەسـەرو ئەوەشـەوە مەعدەنوس تازە یەکێکە لە مادە نیشتیها کەرەوەکان.

٤-برینی دەم. لە زەیتە سەرەکییەکانی مەعدەنوس دا مادەی سیترونیلول، کە ئـەویش پـاك کەرەوەیەکی زۆر چاکە. لەگەڵ ئەوەش دا تـایبە تمەندی تری هەیە کە دژی میکرۆبەکانەو ، چارەسـەری برینـەکانی دەم دەکـات. یارمەتیـدەرە بـۆ چارەسـەر کردنـی قورحـە و بـرین و بوژاندنەوەی هەناسەدان.

٥-کەمی خوێن. مەعدەنوس بڕێکی زۆر مادەی ئاسنی تێدایە، کە یارمەتیدەرە بۆ چارەسـەر کردنی کەم خوێنی.

٦-هەرس کردن. بە هۆی بوونی زەیتە سەرەکییەکان لە مەعـدەنـوس دا، سـوودی هەیـە بـۆ دەردانی ئەنزیمەکان و بۆ سەلامەتی هاڕراوە هەرسییەکان لە گەدەدا، چونکە هەرس ئاسان دەکات. وە سوودمەندە بۆ چارەسەر کردنی هەندێ کێشەی تر وەك لەدەست دانی نیشتیها.

٧-بۆ نەخۆشی ئاوڵە. زەیتە سەرەکییەکانی کە لە مەعدەنوس دەردەهێنرێت دەوڵەمەنـدە و دژی میکرۆبەکانـە، وە دژی ئۆکـسیدەکانە کـە ئـەویش دژی دوژمنەکانـە و ژەهرەکـان و ترشەکان لەناو دەبات. بوونی ڤیتامین C و ئاسن لە مەعـدەنـوس دا کۆئەنـدامی بـەرگری بەهێز تر دەکەن. ئەم تـایبە تمەندییانە یارمەتی نەهێشتن و چارەسەرکردنی ئاوڵە دەدات. هەروەها ئازارەکان کەم دەکاتەوە و کاریگەری دەبێت لەسەر ئارام کردنـەوەی تـووش بـووان بە ئاوڵە.

٨-تێکچوونەکانی سووڕی مانگانە. مەعدەنوس چاکە بـۆ هانـدان و یارمـەتی دانـی غـودەی صەماء (الغدد الصماء) دا، هەروەها یارمـەتی دەردانـی هۆرمۆنـەکان دەدات بـە خێرایـی و ئەوەش دەبێتە هۆی سووڕێکی مانگانەی سروشـتی، و کـەم کردنـەوەی ئازارەکـان لـە مـاوەی سووڕی مانگانەدا.

٩-کێشەکانی چاو. مەعدەنوس بڕێکی زۆر لە مادە دژەکان لە خۆ دەگرێت، سەرەڕای ڤیتامین أ، و ڤیتامین C و چەندین کانزای تری وەك فۆسفۆر ، کە دەبێتە لەناوبردنی کێشەکانی چاو و دوو دڵی و چاو کزی.

١٠-هەوکردنی پێڵووی چاو. وەك ئەوەی پێشتر باسمان کرد، مەعدەنوس پاك کەرەوەیەکی چاکە و دژە میکرۆبی باش لە خۆ دەگرێت کە چاوەکان دەپارێزێت لە نەخۆشییە بە زیانەکان وەك هەوکردنی پێڵووی چاو.

١١-تێکچوونەکانی پێست. پاك کردنەوە و نەهێشتنی ژەهرەکان، دژی کەرووەکانە و دژی ئۆکسیدەکانیشە، وە بە چارەسەرێکی زۆر گرنگ دادەنرێت بۆ نەخۆشییە پێستییەکان وەك ووشك بوونەوە، و ئەکزیما و هەوکردنە کەڕووییەکان.

١٢-شەکری خوێن. مەعدەنوس غودەی صمائ چالاك دەکات و یارمەتیدەرە لە دەردانی ئەنسۆلین لە پەنکریاس، دەست بەسەردا گرتنی دەردانی ڕێژەی ئەنسۆلین لە خوێن دا یارمەتی دەست بەسەرداگرتنی ڕێژەی شەکر دەدات لە خوێن دا.

١٣-سوودی تر. سوودی تر زۆرن کە دەکرێت لە مەعدەنوس وەربگرین، لەوانە دەبێتە هۆی چارەسەرکردنی برینەکان، و هەوکردن و تەشەنوج کردن و پارێزگاری کردنی جگەر. وە هەروەها وەك دژە شێر پە نجەش بەکاردێت، وە مەعدەنوس وەك هاندەرێکی شەهوەی سێکسی سروشتی بەکاردێت ، وە لە بازنەیەکی فراوانیش دا لە دروست کردنی هەندێ گیراوەی دیاریکراودا بەکاردێت، وە بە تێکەڵ کردنی مەعدەنوس لەگەڵ هەندێ سەوزەی تر بۆ بەهێزکردنی ویستی سێکسی بەکاردێت.

پێکهاتەی مەعدەنوس لە ١٠٠ گرام:

| | |
|---|---|
| کالسیوم: | ٤٠ ملگ |
| فۆسفۆر: | ٣٠ ملگ |
| ئاسن: | ١٠ ملگ |
| کیلۆ کالۆری: | ٢٠ |
| پۆتاسیوم: | ٧٠٠ ملگ |
| ڤیتامین C: | ١٢٥ ملگ |

## لوبیای ئەمریکی



**دەوڵەتی سورینام بە یەکەم دەوڵەت دادەنرێت لە بەرهەم هێنانی لۆبیادا. وەك لۆبیا لە فاسۆلیای سەوز دەچێت. لۆبیا درێژ و سەوزە. بەڵام چاندنی لۆبیا لە هۆڵەندا پێویستی بە بوونی کەشێکی گونجاو هەیە وەك ژوورە شووشەییەکان، درێژی لۆبیا نزیکەی ٣٠-٤٠ سانتیمە. لۆبیای تەندروست ترشی فولیك لە خۆدەگرێت، لەگەڵ پۆتاسیۆم و هەندێ کانزای تر، وە هەروەها ڤیتامینەکانی B١و B٦. بەڵام لە ناوچە نیستیوائیەکان لەوانەیە درێژی لۆبیا بگاتە یەك مەتر.**

**سوودە تەندروستییەکانی لۆبیا** ئەمریکی:

**١-لۆبیا باشە بۆ پێستی دەم و چاو، چونکە ڤیتامین C لە خۆدەگرێت بە ڕێژەی ٤٠٪.**

**٢- لۆبیا گرنگە بە نیسبەت تەواوی لاشەوە. لاشەی مرۆڤ پێوستی بە وزەیە بۆ کۆمەڵێکی هەمەجۆر لە چالاکییەکان، وەك هەناسەدان ، و ناردنی خوێن، و ڕێکردن و دانیشتن ، و بیرکردنەوە و ئەو جۆرانە. هەر جوڵانێك پێی هەڵدەستی پێویستی بە بڕێکی دیاریکراو وزە هەیە. هەتا لەو کاتانەش دا کە لاشەت لە ئیسراحەت دایە، چونکە بەردەوام پێویستی بە وزەیە، بۆ دڵنیا بوون لە پارێزگاری کردن لە سووڕی خوێن و هەناسەدان.**

**وە ووزە گرنگە بۆ لاشە بۆ پارێزگاری کردن لە پلەی گەرمی گونجاو بۆ مانەوە لە ژیان دا. منداڵی بچوك و شیرەخۆرە پێویستییان بە وزە هەیە بۆ پاڵپشتی کردنی گەشەی لاشەیان.**

**٣-لۆبیا ترشی فولیك لەخۆ دەگرێت، وە ترشی فولیك سوود بەخشە بۆ کەم کردنەوەی شێرپەنجەی کۆڵۆن، سەرەڕای ئەوەی دەتوانێت ڕێگر بێت لە تووش بوون بە نەخۆشییەکانی دڵ. لەگەڵ نەخۆشیەکانی دڵیش دا هەندێ نەخۆشی تر هەن بە هەمان مەترسی وەك بەرزبوونەوەی کۆلیسترۆڵ لە خوێن دا، وە بەرزبوونەوەی دروست کردنی ( هموسیستین ) بە شێوەیەکی نا سروشتی. وە بۆ لەناوبردنی ئەم نەخۆشیانە ترشی فولیك و ڤیتامین B بەکاربێنە.**

## مێخەك



مێخـەك مادەیـەكی وشـك كـراوە، دەردەهێنرێـت لـە گوڵێـك كـە لـە دارێكـی مـام ناوەنـدی بـەردەوام سـەوزە كـە بـە قەرنـەفیل ناودەبرێـت. داری مێخـەك درێژییەكـەی نزیكـەی ١٠-١٢ مـەترە. ڕەنگـی مێخـەك لـە سـەرەتادا وەك گـوڵ وایـە پاشـان دەگۆڕێت بۆ قاوەیی كاتێك ووشك دەبێتەوە.

دەرهێنراوەكانی مێخەك دەردەهێنرێت لێی وەك بابـەتێكی سەرەكی بە شێوەیەكی زۆر لـە ئیندنۆسیا و باشوری فلیبین. وە بۆ بازرگانی دەنێرێت لە سۆمەترە و جامایكا و بەڕازیل و هینـد و دورگـە ڕۆژئاواكـانی هینـد، و بیمبـا و مدغـشقر و هەنـدێكی تـر لـە ناوچـە ئیستیوائییەكان.

وە لە هەندێك لە ناوچەكانی ئاسیا بۆ لەناوبردنی بۆنی ناخۆشی دەم بەكاردێت، ئامـاژە بەوە دەكرێت كە لە وڵاتی چین لە زیاتر لە ٢٠٠٠ ساڵ، پاشا بەكاری هێنـاوە لـە ڕێگـەی جوین بۆ لەناوبردنی بۆنی ناخۆشی دەم. كـە ئـەوەی لـە چین و ئێـران و كوردسـتان شـتێكی بڵـاوە، وە مێخـەك وەك چـالاك كەرەوەیـەكی سێكسی بـەكاردێت.وە زەڵاتـەی مێخـەك لـە مەتبەخە جیاوازەكان دا بەكاردێت بە هەموو ناوچـەكانی جیهـان دا. هـەروەها مێخـەك بـۆ سووركردنەوە بەكاردێت وەك توابلی هەمە جۆر بۆ لەناوبردنی بۆنی سیر. سەرەڕای ئەوەش، مێخەك برێكی زۆر ڤیتامینی تێدایە. وە بۆ زانینی سوودەكانی مێخەك بە شێوەیەكی فراوان تر بە چەند خاڵێك ئاماژەمان پێداوە، بەم شێوەیە :

**سووده تەندروستییەکانی مێخەك:**

**١-خۆراك دان. مێخەك لـە بڕێکـی زۆر لـە پڕۆتینـات و ئاسن و کاربۆهیـدرات و کالـسیۆم و فسفۆر و صۆدیۆم و پۆتـاسیۆم و ترشی هایدرۆکلۆریك پێك دێـت. هـەروەها دەوڵەمەنـدە بـە ڤیتامینی A و C، و ریشاڵ و مەنگەنیز.**

**٢-رەوانەوەی ئازار. بەکارهێنـانی سیر وەك رەوێنەرەوەیەك دەگەڕێتەوە بـۆ ئـەوەی کـە سـیر مادەیەکی کـارا لـە خـۆ دەگرێـت کـە بـە زەیـتی الاوجینـول ناودەبرێـت، کـە بـەکاردێت بـۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ددان وەك ئازارەکانی ددان. بەڵام مێخەك دەتوانرێت بە تۆپێـك لۆکەی نوقم بوو لە زەیتی مێخەك دا چـەندەها شـتی سەرسوڕهێنەر بکـات دژی کێـشەکانی ددان. هەروەها دەربارەی ئەو زەیتەی لە مێخەك دەردەهێنرێت زانراوە کە دژی بەکتریایە. وە بەکاردێت لە هەوێرەکانی ددان و پاك کـەرەوەکانی دەم و قـورگ بـۆ لـەناوبردنی بـەکتریا. هەروەها بـۆ کـەم کردنـەوەی ئـازار لـە پووکەکانـدا بـەکاردێت و بـۆ پارێزگـاری کـردن لـە تەندروستی ددان بەشێوەیەکی گشتی.**

**٣-مێخـەك وەك مادەیـەکی کـارا بـەکاردێت دژی هەوکردنـەکان، ئـەوەش بـەهۆی بـەرزی پێکهاتـەکانی فلافونویـد تێـی دا. زەیـتی ڕوونـی دەرکـراو لـە مێخـەك بـۆ چارەسـەرکردنی رۆماتیزم و هەوکردنی جومگـەکان بـەکاردێت. هـەروەها ئـەو زەیتـە دەرکـراوە لـە مێخـەك دەتوانرێت وەك ئارام کەرەوەی کۆنەندامی هەناسەدان بـەکاربهێنرێت، وەك سـەرما بـوون و هەڵامەت و رەبوە و هەوکردنی ژووره هەواییەکان ، و هەوکردنی جیوبی لـووت ، و هـەروەها یارمەتیدەرە بۆ خاڵی کردنەوەی کەناڵەکانی لووت.**

**٤- پـاك کـەرەوە و دژی کاریگەرییـەکانی گرژبـوون (کـۆڵنج) . یـەکێکی تـر لـە ئەرکـەکانی زەیتی مێخەك ئەوەیە کە مادەیەکی کارایە و وەك چارەسەر بۆ هەندێ کێشەی باو بەکاردێت وەك برینەکان و هەوکردنەکان و سووتـاوی و پیاکێـشانەکان. لەوانەیـە زۆر بـەکارهێنـانی زەیت لەسەر پێست بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و بە زۆری ببێتە هۆی وروژاندنی پێـست. لەبـەر ئەوە پێویستە زەیتەکە بەشێوەیەکی سووك و بە هەنگاو بەکاربێت. سەرەرای ئـەوەی زەیـتی مێخــەك دژە گرژبوونـــەکان چــونکە یارمەتیــدەرە لـــە ســووك کردنـــی تەشــەنوجاتی عەزەڵاتەکان بەتاییەتی کاتێك بەکاردێت لەسەر هەموو ناوچە گرژ کردووەکان.**

٥-مێخەك سودی تەندروستی زۆری هەیە بۆ کۆلۆن ، دەتوانرێت چارەسەرێکی کارا لە مێخەك دەربهێنرێت و بەکاربهێنرێت بۆ چەندین کێشەی کۆنەندامی هەرس. وە ئەم چارەسەرە کە لە مێخەك دەرهاتووە بە کاردێت بۆ چارەسەرکردنی ئاوسانی سك و قورسی هەرس و ڕشانەوە. مێخەك سوودبەخشە لە کەم کردنەوەی ڕشانەوە و سك چوون و وروژاندنی میکرۆبەکان.

٦-شێرپەنجە. دەکرێت مێخەك مادەیەکی کارا بێت بۆ خۆ پاراستن لە شێرپەنجەی سی و شێرچەنجەی پێست، وە یەکێك لە پێکهێنەرە سەرەکییەکانی کە لە مێخەك دا دۆزراوەتەوە یارمەتیدەرە لە کەم کردنەوەی کاریگەرییە زیانبەخشەکانی کە لە پیساییەکانی دەوروبەرەوە دروست دەبێت، کە دەبێتە هۆی شێرپەنجە لە کۆئەندامی هەرس دا.

٧-سیستەمی ڕێگری. زەیتی مێخەك سیستەمی ڕێگری بەهێز دەکات لە ڕێگەی پاك کردنەوەی خوێن و یارمەتیدەرە لە بەرەنگاربوونەوەی نەخۆشییە جیاوازەکان.

٨-سوودە تەندروستییەکانی تری مێخەك. مێخەك بەکاردێت بۆ چارەسەری هەندێك لە کێشە تەندروستییەکانی وەك مەلاریا و کۆلێرا و نەخۆشی پێست لە وڵاتانی ئاسیای ئیستیوانی.

مێخەك سوودی هەیە بۆ ئەو کەسانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیە لە ڕێگەی دەست گرتن بەسەر ڕێژەی شەکر لە خوێن دا. مادەی ( الاوجینول ) کە بە یەکێك لە مادە پێکهێنەرەکانی مێخەك دادەنرێت ئەویش بەهەمان شێوە کارایە بۆ ڕێگری لە جەڵدەی خوێن. هەروەها زەیتی مێخەك ، دژی کەڕووەکانە و دژی میکرۆبەکانیشە، وە پاك کەرەوە و هاندەری شەهوەی سێکسیشە. ڕۆنی دەرهێنراو لە مێخەك بۆ چارەسەری چەندین کێشەی تەندروستی بەکاردێت ، وەك ئێشانی ددان و قورسی هەرس کردن و تا و ڕەبووە و هیلاك بوون ، و سەر ئێشە و خەوشی خوێن. درەختی مێخەك بە بەردەوامی بە سەوزی دەمێنێتەوە، وە بڕێکی زۆر سوودی تەندروستی بەرهەم دەهێنێت. مێخەك بە شێوەیەکی بەرفراوان بەکاردەهێنرا لە شارستانییەتە کۆنەکانی هیندی و چینییەکان و پاشان لە هەندێ بەشی تری جیهان بڵاو بووەوە، لەوانەش لە ئەوروپا، لە سەدەکانی حەوتەم و هەشتەم. مێخەك دەوڵەمەندە بە

**کانزاکـان وەك کالـسیۆم و ترشـی هایـدرۆلیك و ئاسـن و فـسفۆر و صـۆدیۆم و پۆتـاسیۆم و ڤیتامین A و ڤیتامین C.**

**زەیتی مێخەك:**

**١.هەوکردن: لەبەر تایبە تمەندییە پاك کەرەوەکانی، زەیتی مێخەك سوودبەخشە بۆ برین و خوران و هەوکردنە کەڕوویەکان و پیاکێشانەکان و لـەو جۆرانـە، هـەروەها دەکرێـت وەك چارەسەرێك بۆ پێوەدانی مێرووەکـان بـەکاربهێنرێت. زەیـتی مێخـەك زۆر بـەهێزە لـە ڕووی سروشـتییەوە، لەبـەر ئـەوە پێویـستە خـاو بکرێتـەوە، نابێـت لەسـەر پێـستی هەسـتیار بەکاربهێنرێت.**

**٢. گرنگیدان بە پێستی دەم و چـاو: زۆر جـار ئامۆژگـاری دەکرێـت بـۆ بـەکارهێنانی زەیـتی مێخەك بۆ گرنگیدان بە پێست و بەتایبەتی بۆ ئەو کەسانەی کە زیپکەیان لێ هاتووە.**

**٣. مانـدووبوون: زەیـتی مێخـەك وروژێنـەری شـەهوەی سێکـسییە ، وە زۆر بەسـوودە بـۆ پەستان. هەروەها کاریگەری هەیە لە هاندانی مێشك و ئارەق و ماندوویی مێشك ناهێڵێت. زەیـتی مێخـەك یارمـەتی خـەوتن دەدات و سـوود بەخـشە بـۆ نەخۆشـی (کـەم خـەوی). وە یارمـەتی مێـشك دەدات لـە چـەند ڕوویەکـەوە وەك کەئابـە و لـە بیرچـوونەوە و قەلـەقی. تێکردنی دە دڵۆپ لە زەیتی مێخەك بۆ نیو کـوپ ئـاوی گـەرم، وە بـەکارهێنانی ئاوەکـە لـە سیستەمێکی خۆراکی تایبەت دا دەبێتە هۆی زیادبوونی کارایی سیستەمی خۆراکی.**

**٤.گرنگیدان بە چاو: زەیتی مێخەك چارەسـەرێکی زۆر کارایـە بـۆ کێشەکانی چـاو. لەوانـە هەوکردنی پێڵووەکانی چاو و لەناوبردنی ئازارەکان و کێشەکانی تری ئەرکی چاو.**

**٥.گرنگیدان بە ددانەکان: زەیتی مێخـەك بـە زۆری بـەکاردێت بـۆ ڕاگـرتن و گرنگیـدان بـە ددانـەکان. چـونکە وەك لەناوبەرێکـە بـۆ میکرۆبـەکان و دەتوانرێـت بـۆ کـەم کردنـەوەی ئازارەکانی ددان بە کاربهێنرێت، وەك ئازارەکـانی ددان و پـووك و برینـەکانی دەم. زەیـتی مێخەك پێکهاتەی (ئوجینول) لە خۆ دەگرێت، کـە لـە تەندروسـتی ددان دا چـەند سـاڵێکی زۆرە بەکاردێت.**

**غەرغەرە کردن بە زەیتی مێخەکی خاو کراوە دەبێتە هۆی تەندروستییەکی بـاش بـۆ دەم. وە**

بۆنێکی خۆش دەدات و یارمەتیدەرە لە نەهێشتنی بۆنی ناخۆشی دەم. لەگەڵ ئەوەشدا زەیتی مێخەك لەگەڵ کۆمەڵێکی هەمەجۆر بەرهەمی تەندروستی و چارەسەری ددان بەکاردێت، لەوانە گیراوەی پاك کەرەوەی ددانەکان و پاك کەرەوەکانی دەم.

٦. سەر ئێشە: زەیتی مێخەك لەکاتی تێکەڵ کردنی لەگەڵ خوێ و دانانی لەسەر ناوچەوان، دەبێتە سارد کەرەوەیەك و یارمەتیدەرە بۆ لەناوبردنی سەر ئێشەکەت.

٧. کێشەکانی کۆئەندامی هەناسەدان: زەیتی مێخەك هەناسەدان ئارام دەکاتەوە و دژی هەوکردنە، بەوەش وشکی لووت بە بەتاڵی دەهێڵێتەوە. وە یارمەتیدەرە بۆ چارەسەرکردنی سەرمابوون و هەڵامەت و هەوکردنی جیوبی لووت و ڕەبوْ و سیل و لەکاتی مژینی دا دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی هەوکردنی دەم.

٨. ئازاری گوێ: تێکەڵەیەك لە زەیتی مێخەکی خاوکراوە و زەیتی کونجی هۆکارێکی سەرکەوتووە بۆ لەناوبردنی ئازارەکانی گوێ.

٩. هەرس کردن: زەیتی مێخەك کارایە بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی کە پەیوەندییان هەیە بە گەدەوە وەك قورسی هەرس کردن و هەڵئاوسانی سك و بەوەش مێخەك یەکێکە لە بەکارهێنەرە سەرەکییەکان کە لە خواردنە هیندییەکان دا بەکاردەهێنرێت.

١٠. ڕشانەوە: زەیتی مێخەك سوودبەخشە لە کاتی ڕشانەوەدا و زۆر جار بەکاردەهێنرێت بۆ ئەو ڕشانەوانەی لە کاتی سك پڕی دا دروست دەبێت.

١١. سووڕی خوێن: زەیتی مێخەك کارایی سیستەمی خۆراکی تایبەت بە تۆ زیاد دەکات لە ڕێگەی زیادکردنی سووڕی خوێن و کەم کردنەوەی پلەی گەرمی لەش.

١٢. پاك کردنەوەی خوێن: زەیتی مێخەك یارمەتیدەرە بۆ پاك کردنەوەی خوێن.

١٣. نەخۆشی شەکرە: زەیتی مێخەك یارمەتیدەرە بۆ کۆنترۆڵکردنی ڕێژەی شەکر لە خوێن دا.

بەوەش سوود بەخشە بۆ ئەو نەخۆشانەی کە تووشی شەکرە بوون.

١٤. سیستەمی بەرگری: زەیتی مێخەك سوود بەخشە بۆ هاندانی سیستەمی بەرگری و دژی ڤایرۆسەکانە و توانای پاك کردنەوەی خوێنی هەیە و بەرگری بۆ نەخۆشیەکانیش زیاد دەکات.

١٥. چارەسەری کێشەی خێرایی هەڵدان ( سرعه القذف ) لای پیاوان، سیر لەوانەیە سوود بەخش بێت بۆ چارەسەری ئەم نەخۆشیە بەڵام مێخەك سوودێکی زیاتری هەیە.

١٦. کۆلێرا: زەیتی مێخەك سوودبەخشە بۆ چارەسەری نەخۆشی کۆلێرا.

١٧. ڕەبۆ: خواردنەوەی زەیتی مێخەك یارمەتیدەرە بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی خانە هەواییەکان و ڕەبۆ و نەخۆشیەکانی تری کۆئەندامی هەناسە هەروەها یارمەتیدەرە لە پاك کردنەوەی خوێن دا.

١٨. لە دروستکردنی سابون دا: لەبەر ئەو بۆنە خۆشەی کە هەیەتی و ئەو تایبەتمەندییە پاك کەرەوانەی، بڕێك لە زەیتی مێخەك بۆ دروستکردنی سابوون زیاد دەکرێت.

١٩. گیراوەکانی جوان کاری: زۆر جار زەیتی مێخەك زیاد دەکرێت بۆ گیراوەکان و لە زەیتی شێلانیش دا بەکاردێت چونکە دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی ئازار و ماندوویی.

٢٠. مێخەك لە دروستکردنی جگەرەدا: لەم دوواییانەدا هەندێك لە کارگەکانی دروستکردنی جگەرە دەستیان کرد بە بەکارهێنانی مێخەك لە جگەرەدا، وەك لە وڵاتی ئیندنوسیا دەکرێت. دەرکەوتووە کە کاریگەرییە خراپەکانی جگەرە پوچەڵ دەکاتەوە و هەروەها زەیتی مێخەك لە خواردنە جیاوازەکان دا بەکاردەهێنرێت بۆ ئەوەی تامێکی خۆشی پێ ببەخشێت و لە چەندین خواردنی ئاسیایی و ساس و کێك و شتی تردا بەکاردەهێنرێت.

٢١. عەتر و بۆن. زەیتی مێخەك لە دروستکردنی بۆنە خۆشەکان دا بەکاردێت.

زۆر خەڵکی بڕوایان وایە کە زەیتی مێخەك سوودبەخشە بۆ خۆ پاراستن و چارەسەرکردن لە نەخۆشی شێرپەنجە بەهۆی بوونی تایبەتمەندی چارەسەر لە زەیتی مێخەکدا. هەروەها لەلای زۆر کەسیش وا دانراوە کە زەیتی مێخەك چارەسەرێکی چاکە بۆ هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی.

ئامۆژگاری:

پێویستە وریا بیت لە بەکارهێنانی زەتی مێخەك. زەیتی مێخەك بەهێزە بە سروشتی خۆی، لەبەر ئەوە پێویستە خاو و سووك بکرێتەوە پێش بەکارهێنانی.

زەیتی مێخەك تێکەڵ دەکرێت بە باشی لەگەڵ زەیتە سروشتیەکان، لەوانە زەیتی ڕەیحانە و زەیتی ڕۆزماری و زەیتی دارچینی و زەیتی میوە و زەیتی لیمۆ و زەیتە سەرەکییەکانی نەعنا و زەیتی پرتەقاڵ و زەیتی عەتری خەزامی و میسك و هتد..

پێکهاتەی مێخەك لە ١٠٠ گرام:

| | |
|---|---|
| کالسیۆم: | ٦٤٦ ملگ |
| پرۆتین: | ٥,٩٨ گرام |
| پۆتاسیۆم: | ١١٠٢ ملگ |
| کاربۆهیدرات: | ٦١,٢١ گرام |
| مەگنیسیۆم: | ٢٦٤ ملگ |
| مەنگەنیز: | ٣٠,٠٣٣ ملگ |
| ڤیتامین C: | ٨٠,٨ ملگ |
| ڤیتامین K: | ١٤١,٨ ملگم |
| چەوری: | ٢٠,٠٧ گرام |
| مادە ریشاڵیەکان: | ٣٤,٢ گرام |

عنب الثعلب کروس بیری



**عنب الپعلب برێکی زۆر سوودی تەندروستی لە خۆدەگرێت، وە ڕێژەیەکی زۆری لە ڤیتامین C تێدایە. وە یارمەتیدەرە لە دەرهێنانی سوودەکان لە خواردەمەنییەکانی تر، جگەر بەهێز دەکات و خواردنی مێشك دابین دەکات و، پشتگیری دڵ دەکات و سییەکانیش بەهێزتر دەکات، وە یارمەتی کۆئەندامی میز دەدات و باشە بۆ پێستی دەم و چاو و یارمەتی تەندروستی قژ دەدات و گەرمی لەش کەم دەکاتەوە و کاریگەری ژەهرەکان کەم دەکاتەوە و، چالاکی لاشە زیاد دەکات و چاوەکان بەهێز دەکات و هێزی ماسولکەکان باشتر دەکات و وەك دژی ژەهرەکان بەکاردێت. ئەم میوەیە لە وەرزی هاوین دا دەڕوێت لە دارستانە تەڕەکان لە ناوچە شاخاوییەکان لە نیمچە دورگەی هیند. بە درەختێکی پیرۆز دادەنرێت لە هیند. وە بەرەکەیشی دەوڵەمەندە بە سوودی زۆر. خەیاڵ و حەز و زەوق باش و ڕوون دەکاتەوە. ئەگەر میوەکە تەڕ بێت یان وشك لە هەردوو حاڵەتەکەدا چەندەها سوودی تەندروستی لە خۆ دەگرێت. وە یەکێکە لە باشترین سەرچاوەکانی ڤیتامین C. هەروەها مادە خۆراکییەکانی تر لە خۆدەگرێت وەك کاروتین و ڕیشاڵەکان و ئاسن و کالسیۆم، و ترشی تانیك و فسفۆر و برێك لە کاربۆهیدرات. دژە ئۆکسیدە و دەوڵەمەندترین سەرچاوەیە بۆ ڤیتامین C، کە ئەویش بەرپرسە لە لەناوبردنی دەرکەوتنی خانە و نیشانەکانی پیربوون. وە یارمەتیدەرە بۆ جێگیر بوونی لاشە.**

سوودە تەندروستییەکانی عنب الثعلب کروس بیری :

**١-چاك کردنی کرداری هەرس. بوونی ڤیتامین C و ڕیشاڵەکان لە عنب التعلب دا، یارمەتی هاندانی هەرس دەدات. وە یارمەتی مژینی کانزاکان دەدات بە شێوەیەکی باشتر، وە مادە خۆراکییەکانی تر، لەگەڵ یارمەتیدانی بۆ ئەنجامدانی کاری هەرس. دەبێتە زیاد کردنی**

تەمسیلی خۆراکی لەبەر ئەوەی ڤیتامین Cلـە خـۆ دەگرێـت، بـە یارمـەتی بـەرگری لـەش و چارەسەری قەبزی دەکات.

٢- عنب التعلب یارمەتی باشتر کردنی نیشتیها دەدات و هانی هێزی تام کردن دەدات لـەلای نەخۆشەکان کە هەستی تامیان لەدەست داوە بەهۆی تووش بوونیان بە نەخۆشـی بـۆ مـاوەی دوورو درێژ.

٣-کەم کردنەوەی کێش. کارایی تەمسیلی خۆراکی زیاد دەکات. چـونکە زۆر باشـە بـۆ دەست گرتن بەسەر خواردنی خۆراك ئەگەر ویستت کێشت کـەم بکـەیت. ئـەو کەسـانەی دەنـاڵێنن بەدەست قەڵەوی رادەبەدەر و زۆری کێش، دەتوانن شەربەتی عنب التعلب بخۆنەوە لـە بـەرە بەیان دا، چونکە یارمەتیدەرە بۆ زیاد کردنـی کـارایی تەمـسیلی خـۆراکی، بـەو شێوەیەش یارمەتیدەرە لە بەدیهێنانی ئەو کێشەی کە دەتەوێت.

٤-لەناوبردنی ژەهرەکان. تایبە تمەندییەکی باش لـە خـۆ دەگرێـت ئـەوی ئەوەیـە کـە دژی ئۆکسیدە و یارمەتیدەرە لە لەناوبردنی ژەهرەکانی ناو جگەر. یارمەتی ئەو کەسـانە دەدات کە ڕەوێنەری ئازار و چارەسەری تر و ، ئەوانەی کە مەی و جگەرە دەخۆن، یارمـەتیان دەدات بۆ لەناوبردنی ئەو ژەهرانەی کە لە ناو جگەریان کۆدەبێتەوە.

٥-چاك کردنی تەندروستی پێست و قژ. بەهۆی لە بوونی ڤیتامین C تێیدا یارمـەتی پـاك کردنەوەی خوێن دەدات، کە ئـەویش پارێزگـاری لـە پـاك مانـەوەی پێـست دەکـات و خـاڵی بـوونی پێـست لـە خـەوش و زیپکـە. خـۆراك دەری ڕەنگـەکانی قـژە و سپی بـوونی قـژ دوور دەخاتەوە. هەروەها وەرینی قژ ناهێڵێت. بەکارهێنانی شەربەتی عنب التعلب تەڕییەك بـۆ قژی سەر دەستە بەر دەکات و یارمەتی قژ دەدات بۆ لەناوبردنی کرێش.

٦-کەم کردنەوەی کۆلیسترۆڵ. یارمەتیـدەرە لـە پاراسـتنی ڕێـژەی کۆلیـسترۆڵ بـەهۆی لـە خـۆگرتنی مـادەی دژە ئۆکـسیدەوە. هـەروەها لەبـەر ئـەوەی ڕیـشاڵەکان لـەخۆدەگرێت و یارمەتی دابەزاندنی ڕێژەی کۆلیسترۆڵ دەدات.

٧-ئەو کەسانەی دەناڵێنن بە نەخۆشی شەکرە بەردەوام لەبەردەم ئەگەری تـووش بـوون بـە نەخۆشییەکانی ترن. وە خواردنی عنب التعلب بەشێوەیەکی ڕێك خراو بەرگرییەکی باشە بۆ نەخۆشییە جیاوازەکـان کـە پەیوەنـدییان بـە نەخۆشـییەکانی دڵ و جگـەر و کۆئەنـدامی

هەرسەوە هەیە.

٨- بڕێکی کەم لە شەکر لە خۆدەگرێت، کە ئەمەش یارمەتیدەرە لـە ڕێکخستنی شـەکر لـە خوێن دا. وە ئەوەش بەهەمان شێوەیە بە نیسبەت ئـەو ڕیشاڵانەی کـە لـە عنـب التعلب دا هەن. ڕیشاڵەکان یارمەتیدەرن لە خاو کردنەوەی چوونە نـاوەوەی ڕێژەیـەکی زۆر لـە شـەکر کە لە خوێن دایە بۆ ناو جۆگەلـەکانی خـوێن وە پارێزگـاری لـە جێگیری شـەکر دەکـات لـە خوێن دا.

١٠- عنب التعلب دژی هەوکردنەکانە. چونکە یارمەتیدەرە لە حاڵەتەکانی وەك هـەوکردنی شێرپەنجەی گورچیلە و نەخۆشی شەکرە.

١١- یارمەتیدەری لەشە بـۆ دەرکـردن و لـەناوبردنی ژەهرەکـان لـە لاشـەدا و چـاك کردنـی چۆنیەتی بەرگری لە لەش.

١٢- بڕێك لە ڤیتامینە پێویستەکان لە خۆدەگرێت کە گرنگن بۆ بەهێزکردنی بیر و زاکیرە.

١٣- وزە دەبەخشێت و چالاکی لەش زیـاد دەکـات. وە ئەمـەش دەکرێـت بێتـە دی لـە ڕێگـەی خواردنەوەی شەربەتی تـازەی ئەم میوەیە ، لەگەڵ ژەمە خواردنە ئاساییەکان.

١٤-شێلانی سەر بە عنب التعلب، یارمەتی خەو لێکەوتن دەدات و شتێکی باشە بۆ قژ.

١٥-بـەکارهێنانی ٢-٤ دڵـۆپ لـە شـەربەتەکەی لـە هـەر یەکـە لـە کونـەکانی لـوت بـۆ چارەسەرکردنی نەزیفی لوت.

١٦- خۆراکێکی بەهێزە بۆ مێشك.

١٧-ڕێژەی هیمۆگلۆبین و خانە سوورەکانی خوێن زیاد دەکات.

١٨-سوود مەندە بۆ هەوکردنی بەشە هەواییەکان و تا و ڕەبووە.

١٩- گەدە پاك دەکاتەوە و ددانەکانیش بەهێز دەکات..

٢٠-گیراوەکەی بەکاردەهێنرێت بۆ مانەوەی خانە زیندووەکان بۆ ماوەیەکی دورودرێژ.

٢١-٣ کەوچك لە شەربەتەکەی بەکاربێنە ڕۆژانە ( بەیانی و شەو ) لەگـەڵ بڕێکـی یەکـسان لە ئاو. شەربەتەکە بخۆرەوە پێش خواردنی نان بۆ بەدەست هێنـانی ئەنجامێکی باشتر.

**پێکهاتەی کروس بیری لە ١٠٠ گرام:**

**کالسیۆم: ٣٠ ملگ**

**فۆسفۆر: ٣٠ ملگ**

**کیلۆ کالۆری: ٤٩ پۆتاسیۆم: ١٩٨ ملگ**

**سۆدیۆم: ٣ ملگ**

**فیتامین C: ٣٠ ملگ**

کەرمەتێنا



کەرمەتێنا لە ترشییەکان دادەنرێت و ڕەنگێکی پرتەقاڵی هەیە. وە چوار جۆری ناسراوی هەیە، سەرەتای ئەو چوار جۆرە لە چین و یابان بوو. درەختی کەرمەتێنا دەگاتە ئەوپەڕی بەرزی کە دەکاتە نزیکەی ٥ مەتر. گەڵاکانی سپییە، سپی بچووك، وە گوڵەکانی لە شێوەی ئەستێرەدایە و دڕك لە هەندێکیان دا هەیە. بەری کەرمەتێنا هەندێ جار هێلکەییە و زۆر جار لە ٢ پەنجە کە مترە لە درێژی دا.

تامێکی خۆشی هەیە یان ترش وە لەوانەیە بە تەنها بخورێت یاخود لە مرەبادا. کەرمەتێنا زۆر دەوڵەمەندە بە ڤیتامینەکانی A, B, C.

هەروەها کانزاکان لە خۆ دەگرێت .ئەم میوەیە زۆر بەسوودە بۆ هەڵامەت و هەوکردنی بەشە هەواییەکان و سەرمابوون، و هەوکردنی قورگ و ، تا و سکچوون و تێکچوونەکانی سپڵ. گەڵا و بەرەکانی کەرمەتێنا زەیتە سەرەکییەکان لە خۆدەگرێت، لە کاتێك دا کە میوەکە شەکرەکان و ترشەکانی تێدایە.

وە میوەکەی بە تازەیی دژە کۆکە و دەبێتە نەهێشتنی عارەق. کەرمەتێنا کۆلیسترۆڵ و ڕۆنەکان و صۆدیۆمی ئازاد لە خۆدەگرێت وە سەرچاوەیەکی باشە بۆ ڕیشاڵەکان و ڤیتامین A, C.

هەروەها ڤیتامینی کالسیۆم و ئاسنیش لە خۆدەگرێت، بە نیسبەت ئەو کەسانەی کە شوێنی سیستەمێکی خۆراکی کەوتوون، خواردنی نزیکەی هەشت کەرمەتێنا نزیکەی ١٠٠ تاووزە لە خۆدەگرێت.

**سووده تەندروستییەکانی کەرمەتێنا :**

**١-دەوڵەمەندە بە سەرچاوەکانی کانزاکان وەك مس و کالسیۆم و پۆتاسیۆم و مەنگەنیز و ئاسن، و سیلینیوم و زەنك. ١٠٠ گرام لە هە نجیری وشك نزیکەی ٦٤٠ ملیگرام لە پۆتاسیۆمی تێدایە، لەگەڵ ١٦٢ ملیگرام لە کالسیۆم، وە ٢,٠٣ ملیگرام لە ئاسن. ماددەی پۆتاسیۆم بە پێکهێنەرێکی سەرەکی پێکهێنەری خانە و شلەکانی لەش دادەنرێت کە یارمەتیدەرە لە دەست گرتن بەسەر رێژەی لێدانەکانی دڵ و پەستانی خوێن. بەڵام مس بە مادەیەکی گرنگ دادەنرێت لە دروست کردنی خرۆکە سوورەکانی خوێن. وە ئاسن گرنگە بۆ پێکهێنانی خرۆکە سوورەکانی خوێن و ئۆکسیدە خانەییەکان.**

**٢-دەکرێت پرتەقاڵی ئاڵتونی لەگەڵ توێکڵەکەیدا بخورێت، ئەمەش تایبە تمەندییەکە کە جیای دەکاتەوە لە ترشەکانی تر. توێکڵی کەرمەتێنا دەوڵەمەندە بە چەندەها زەیتی سەرەکی، و دژە ئۆکسید و ریشاڵەکان. ١٠٠ گرام لە کەرمەتێنا بڕی ٦,٧ گرام یان ١٧٪ رێژەی رۆژانەی ریشاڵەکان دابین دەکات، کە پێك دێت لە ، تانین هیمیسیلولوز، وە بەکتین و جگە لەو لە پێکهێنەرەکان و شەکرەمەنیەکان و نیشاستە.**

**٣-پرتەقاڵی ئاڵتونی پڕە لە دژە ئۆکسیدەکانی فینول و فلافونوید کە سوودە تەندروستییەکان لە خۆدەگرێت وەك کارۆتینەکان و هە نجیر و زیاکسانپین ، و ئەو جۆرە زەیتانە. بەڵام توێکڵی پرتەقاڵی ئاڵتونی چەندەها مادەی سەرەکی گرنگ لە خۆدەگرێت لەوانە لیمۆنین و بینین و بیرکاموتین و کاریوفیلین، ئەم پێکهاتووانە بە تایبەتی لە کەرمەتێنا دا هەن.**

**٤- کەرمەتێنا وەك ترشەکانی تر وایە بڕی تاووزەکان تێیدا کەمە. ١٠٠ گرام لە پرتەقاڵی تازە نزیکەی ٧١ تاووزەت پێدەبەخشێت. لەگەڵ ئەوەش دا بە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی بێ وێنە دادەنرێت بۆ ریشاڵە خۆراکییەکان و کانزاکان و ڤیتامینەکان و ماددەکانی دژە ئۆکسید کە بە شێوەیەکی زۆر یارمەتیدەرە بۆ تەندروستی و ئیسراحەتی.**

**٥-دەتوانرێت هەندێك ڤیتامینی دژە ئۆکسیدەکان لە میوەکە بە تازەیی دەربهێنرێت، وەك ڤیتامین A , C, E. لەگەڵ توانای دا بۆ لەناوبردنی زەڕە ئۆکسجینە زیانبەخشەکان کە لە رەگە ئازادەکانی لاشەوە وەردەگیرێت، بەوەش لاشە لە شێرپەنجە دەپارێزێت،و لە**

نەخۆشی شەکرە و هەوکردنە بەردەوامەکان.

٦- کەرمەتێنا زۆر دەوڵەمەندە بە ڤیتامین C. ١٠٠ گرام لێی نزیکەی ٤٧,٩ یاخود ٧٢٪ لە RDA دابین دەکات ( ئەو ڕێژەیەی ئامۆژگاری دەکرێت ڕۆژانە ).

ڤیتامین C کە بوونی هەیە لە کەرمەتێنا دا بە یەکەیێك لە دژە ئۆکسیدە بەهێزە سروشتییەکان دادەنرێت کە هەڵدەستێ بە ئەرکی بایەلۆجی سەرەکی، وەك پێکهاتەی کۆلاجین و چارەسەر لە برین، هەروەها چالاکی دژە ڤایرۆس و دژە شێرپەنجەی هەیە و یارمەتیدەرە لە خۆپاراستن لە نەخۆشییەکانی نەعصاب، و هەوکردنی جومگەکان و شەکرە و هیتر.

لەگەڵ ئەوەش دا ، ڤیتامین C هاندەرە بۆ مژینی ئاسن.

٧- کەرمەتێنا ڕێژەیەکی باش ڤیتامین ( ب ) پێکهاتەی تێدایە وەك پیامین و نیاسین و بیریدوکسین و ترشی فولیك و ترشی بانتوپنیك. ئەم ڤیتامینانە وەك هاندەرێکی باش بۆ یارمەتیدانی کاری تەمسیلی خۆراکی برۆتینەکان و کاربۆهیدراتەکان و ڕۆنەکان دادەنرێت.



٨- پارێزگاری دژی زۆری هەوکردن.

٩-باشتر کردنی بەرگری ڕێساکانی لەش.

١٠-باشکردن وەرگرتنی مادەی ئاسن

١٢-بەرگری کردن لە شکاندنی خانەکانی لەش.

١٣-باشکردنی تەندروستی پوکی دان.

١٤-دابین کردنی دانێکی تەندروست و باشکردنی.

١٥-بەرگری کردن دژی ( vrise radicalen ).

١٦-بەرگری کردن لە دژی دڵ و نەخۆشیە چەورییەکان.

١٧-یارمەتی دەدات دژی نەخۆشی شەکرە و بەشی دوو.

١٨-کەم کردنەوەی پیری.

١٩-دەتوانێت کەم کردنەوەی خانەکانی شێر پە نجە.

٢٠-بەرگری وشك بوونەوە و خورانی پێست.

٢١-بەرگری کردن لە زوو زوو سەرماوبون.

٢٢-بەرگری کردن لە توڕەبوون.

٢٣-کەمکردنەوەی مەترسییەکان بۆ سەر ڕەق بوونی دەمارەکان ( frequente ).

٢٤-بۆ کەمکردنەوەی مەترسییەکانی قەڵەوی ( ocesitas ).

٢٥-بۆ کەم کردنەوەی ئازاری کێشی زۆر ( قەڵەوی ).

٢٦-کەم کرنەوەی هیلاکی و ماندووبوون.

پێکهاتەی کەرمەتێنا لە ١٠٠ گرام:

| | |
|---|---|
| کالسیۆم: | ٦٢ ملگ |
| ئاسن: | ٠,٨٦ ملگ |
| پۆتاسیوم: | ١٨٦ ملگ |
| النحاس: | ٠,٠٩٥ ملگ |
| مەگنیسیوم: | ٢٠ ملگ |
| مەنگەنیز: | ٠,١٣٥ ملگ |
| سۆدیۆم: | ١٠ میلی گرام |
| فیتامین A: | ٢٩٠ وحدە دولیە |
| فیتامین C: | ٤٢,٩ ملگ |
| فیتامین E: | ٠,١٥ ملگ |
| الزنك: | ٠,١٧ ملگ |

## زەردەچەوە



زەردەچەوە، خۆش کەرێکی تایبەتـــە، خـــاوەنی سوودێکی زۆرە. ئەم گیایە زیاد دەکرێت، کە بەشێکە لە کاری، زیاد دەکرێت بۆ خواردنـــەکان لـــە زۆر وڵاتـــانی ڕۆژهـــەڵاتی ناوەڕاســـت. وە لـــە تەندروستی دا بەکارهێنراوە لە پێش چەند سەدەیەك. وە بەکارهێنانی زیاد دەکات بەهۆی سوودە زۆرەکانییەوە.

زەردەچەوە چارەسەرێکی کارای شێرپەنجە و چەندەها نەخۆشی تر لە خۆدەگرێت. وە وەك زانراوە کە زەردەچەوە لە هیند بە "گیراوەی پیرۆز" ناودەبرێت. وە بۆ چەند سەدەیەك وەك چارەسەری برین و هەوکردنەکان و کێشە تەندروستییەکان بەکارهێنراوە.

لە وڵاتانی ئاسیای کۆن و وڵاتانی تر، وە زەردەچەوە لە سیستەمی تەندروستی دا بەکاردێت بۆ ماوەی هەزارەها ساڵ ، وە لە ئێستادا هەندێك لێکۆڵینەوەی نوێ ئاماژە بەوە دەکەن بۆ چۆنیەتی کاری دارچینی بەشێوەیەیکی تەواو.

وە ڕەنگیش لەخۆی دەگرێت کە ڕەنگێکی زەرد دەبەخشێت بە زەردەچەوە وای لێدەکات نزیك بێت لە ڕەنگی پرتەقاڵی. زەردەچەوە یارمەتی خانەکان دەدات بۆ بەرگری کردن دژی ڤایرۆسەکان و هەندێ جۆری دیاریکراو لە شێرپەنجە.

لە وڵاتە ئاسیاییەکان زەردەچەوە بە شێوەیەکی بەرفراوان بەکاردێت، بۆ لەناوبردنی هەندێ جۆر شێرپەنجە، وە بەکارهێنانی بڵاوبۆتەوە لە جیهانی ڕۆژئاوای ئێستا، بەڵام بەشێوەیەکی کەم، لەوانە : قۆڵۆن یان شێرپەنجەی قۆڵۆن و المستقیم و شێرپەنجەی مەمك و شێرپەنجەی پرۆستات و شێرپەنجەی سییەکان.

**سوودە تەندروستییەکانی زەردەچەوە:**

**١- پیاکێشان و لاربوون و برینەکان:.**

**أ. دانانی گیراوەی زەردەچەوە لەگەڵ لیمۆ یان ناو لەسەر ئەو بەشەی تووشی نەخۆشی بووە دەبێتە هۆی نەهێشتنی گرێ و ئازار و پیاکێشانەکان.**

**ب. خواردنی زەردەچەوە لەگەڵ شیری گەرم سوودبەخشە بۆ ئێسکەکان.**

**ج. زەردەچەوە بە خێرایی نەزیفی برینەکان دەوەستێنێت، وە چارەسەرکردنی خێرا دەکات.**

**د. بەکارهێنانی گوڵی زەردەچەوە لەگەڵ زەیتی خەردەل بۆ چارەسەری لە جێچوون بەکاردێت بە پەستان کردنە سەر ناوچە لە جێچووەکە بۆ ئەوەی سووری خوێن چاك بکات.**

**ه. بەکارهێنانی گیراوەی زەردەچەوە و چا لەگەڵ ئاوی خوێیاوی لەگەڵ لەزگەکان بۆ چارەسەری شکان.**

**٢. پێوەدانی مێرووەکان. تێکەڵێك لە گیراوەی زەردەچەوە و ترشی لیمۆ کاریگەری ژەهر کەم دەکاتەوە.**

**٤-کۆکەی دیکی (الشاهوق) بە ئینگلیزی Pertussis:.**

**یەك کەوچکی بچووك لە زەردەچەوەی گیراوەی زەوی، لەگەڵ ٢ کەوچکی خواردن لە هەنگوین ٣-٤ جار لە رۆژێك دا، کۆکە کەم دەکاتەوە.**

**ب. مژینی کەمێك لە زەردەچەوە کۆکە کەم دەکاتەوە.**

**٥. قورسی هەرس کردن و کێشەکانی گەدە:.**

**أ. بەکارهێنانی گیراوەی زەردەچەوە لەگەڵ بڕێکی یەکسان لە خوێ و تواندنەوەی لە ئاوی گەرم دا یارمەتی لەناوبردنی دڵە کزێ.**

**ب. بەکارهێنانی زەردەچەوەی زەوی لەگەڵ نیو بیبەر و حێل لە دوای خواردنەکان یارمەتی لەناوبردنی کێشەکان دەدات.**

ماسولکە ریشالیەکانی دڵ    گرێ



**ج. خواردنی زەردەچەوە بە تێکەڵ کراوی لەگەڵ ئاو لەدوای خواردن یارمەتی**

چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆئەندامی هەرس دەدات.

٦. کێشەکانی پێست:

أ. بەکارهێنانی هەویری زەردەچەوە لەگەڵ ئاودا لەسەر شوێنی بەرکەوتوو، بۆ لەناوبردنی پەڵە سپییەکان.

ب. بەکارهێنانی هەویری زەردەچەوە و زەیت زیادکردنی زیپکەی پێست دەوەستێنێت.

٧. حەساسیەت:

أ. گیراوەی زەردەچەوە لەگەڵ یەك کەوچکی بچووك لە هەنگوین دووجار لە ڕۆژێك دا یامەتی لەناوبردنی حەساسیەت دەدات.

ب. بەکارهێنانی زەردەچەوە لەگەڵ شەکر بۆ چارەسەری خووران.

ج. نوقم کردنی لۆکە لە زەیتەکەی دا بۆ لەناوبردنی زیپکە.

د. مەساج کردن بە دەم و چاو بە تێکەڵێك لە شیر و زەردەچەوەی زەوی، بۆ ماوەی ١ سەعات پێش حەمام، پەڵەکان لەناودەبات و ڕووناکییەکی سروشتی دەبەخشێت.

٨. کۆکە و سەرمابوون و ڕەبوە:

أ. بەکارهێنانی گیراوەی زەردەچەوە و خوێ لەگەڵ ئاوی گەرم یان ½ کەوچکی بچوك لە هەنگوین لەگەڵ کەوچکێکی بچوك لە گیراوەی زەردەچەوە یارمەتی دەرە بۆ لەناوبردنی کۆکە و داخرانەکانی بەشە هەوابیەکان دەکاتەوە.

ب. ٤/١کەوچکی بچووك لە زەردەچەوە لەگەڵ ئاوی گەرم دا سوودبەخشە بۆ دەست گرتن بەسەر هەڵامەتی لووت.

ج. هەڵمژینی بوخاری زەردەچەوە.

ه. کوڵانی زەردەچەوە لە شیر دا و پاشان خۆش کردنی بە شەکر سوودبەخشە بۆ لابردنی سەرمابوون و ڕەبوە.

و. مژینی پارچەیەك لە زەردەچەوە یان دانانی پارچەیەك لە زەردەچەوە لە دەم دا لە ساتە جیاجیاکان دا توش بوون بە سەرما کەم دەکاتەوە.

ز. تێکەڵێك لە گیراوەی زەردەچەوە، و گیراوەی جۆ و مۆز بە ڕێژەی یەکسان لەگەڵ زیادکردنی هونگوین بۆی بە پێی ویست و ئارەزوی خۆت، وە بەکارهێنانی بۆ ماوەی ٤-٥ ڕۆژ. لاشە ڕزگار دەکات لە لینجی هەڵگیراوی لەش.

ح. مەساج کردن بۆ سنگ و دەم بە گیراوەی زەردەچەوە بە کەمی، تێکەڵ کراو لەگەڵ بیبەری

ڕەش و چا بۆ کەم کردنەوەی وروژاندنی قەسەبەکانی هەوا.

چ. هەڵمژینی بوخاری زەردەچەوە.

ك. بەکارهێنانی ٤/١کەوچکی بچووك لە گیراوەی زەردەچەوە، ٣-٤ بڕ لەگەڵ ئاوی گەرم وەك هۆکارێك بۆ بەدەست هێنانی پارێزگاری دژی ڕەبوە.

٩. هەوکردنی لەوزەتێن. مەعکەرۆنەی دروست کراو لە ١٠ گرام لە گیراوەی زەردەچەوە، لەگەڵ زەیتی خەردەل پاشان دانانی لە دەوری مل، دەبێتە کەم کردنەوەی هەوکردنی لەوزەتێن.

١٠. کرمەکان. هەویر لە گیراوەی زەردەچەوە و ٢/١کەوچکی بچووك لە هەنگوین لەگەڵ کەوچکێکی بچوك لە vayavidang choorna بۆ ماوەی ٧-٨ ڕۆژ، کرمەکانی لاشە دەکوژێت.

١١. زیپکەکانی دەم. غەرغەرە کردن بە کوپێك لە ئاو کە گیراوەی زەردەچەوە لە خۆدەگرێت پاش کوڵانی بۆ ماوەیەکی کەم، وە بەکارهێنانی دووجار لە ڕۆژێکدا ، دەبێتە چارەسەر.

١٢. کێشەکانی لوولەکانی میز. توێکڵ یان شەربەتی زەردەچەوەی خام و هەنگوین لەگەڵ شیری مەڕ، دووجار لە ڕۆژێك دا، هەموو کێشەکانی میز چارەسەر دەکات.

١٣. ئاوڵە.

أ. بەکارهێنانی کەوچکێکی بچووك لە زەردەچەوە لەگەڵ خورمای هندی و بۆ ماوەی ٤-٥ ڕۆژ وەك پارێزەرێك لە ئاوڵە.

ب. بەکارهێنانی گیراوەی زەردەچەوە، وە کرێم لە شیری تازە و ئاردی گەنم، وە تێکەڵ دەکرێت لەگەڵ زەیتی خەردەل یاخود خامەی تازە و دانانی لەسەر بەشە نەخۆشەکە، دوو جار لە ڕۆژێك دا، سووانی بە ئاوچە تووش بووەکان بە ئاوڵە دەبێتە بەخشینی ڕوویەکی نەرم.

١٤. سك پڕی و ئاگا لێبوونی لەدوای لەدایك بوون:.

أ. بەکارهێنانی ١ کەوچکی بچووك لە گیراوەی زەردەچەوە لەگەڵ شیری گەرم لە ڕۆژەکانی کۆتایی لە مانگی نۆیەمی سك پڕی یارمەتیدەرە بۆ لەدایك بوونێکی ئاسان.

ب. بەکارهێنانی ١ کەوچکی بچووك لە زەردەچەوە لەگەڵ شەکر لەدوای ماوەیەك بە منداڵ بوون بۆ نەهێشتن و کەم کردنەوەی گرێی ڕەحم.

١٥. ئازاری سنگ. سووانی بەشی توشبوو بە زەردەچەوە یارمەتی لەناوبردنی ئازارەکان

دەدات.

١٦.هەوکردنی جومگەکان. بەکارهێنانی ٢/١گرام لە زەردەچەوە، گوێزی هندی المحمص، ١ گرام لە شەکر، و ٢٠٠ گرام لە پاقلەی سودانی ڕۆژانە لە بەیانیان لەگەڵ ڕەیحانە یاخود چای لیمۆ. هەروەها یارمەتیدەرە بۆ لەناوبردنی ئازار و گرێکان.

١٧. ئازاری ئێسکەکان:.

أ.شێلانی ناوچەکە بە زەیتی زەردەچەوە یارمەتی کەم کردنەوەی ئازارەکان دەدات.

ب.شێلانی ئێسکەکان بە هەویری دروست کراو لە گیراوەی زەردەچەوە لە شیردا یارمەتی لەناوبردنی ئازارەکان دەدات بە خێرایی.

ج.بەکارهێنانی هەویری گیراوەی زەردەچەوە لە ئاوی گەرم دا لەسەر ئێسکە توش بووەکان بە چارەسەرێکی باش دادەنرێت.

١٨.زەردووی و کێشەکانی جگەر. بەکارهێنانی ٤-٥ بڕ لە گیراوەی زەردەچەوە لەگەڵ ئاو یاخود هەنگوین دوو جار لە ڕۆژێك دا، بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەو کێشانەدا.

٢٠.لاوازی لە لای پیاوان. بردنی نزیکەی ٧-٨ گرام لە زەردەچەوەی تەواو لەگەڵ بڕێکی یەکسان لە هەنگوین لەگەڵ شیری مەڕ ئەنجامێکی باش دەدات.

٢١.کێشەکانی ددان:

أ.سووانی ددانی بە ئازار بە زەردەچەوە ئازار و گرێکان لەناو دەبات.

ب.بەکارهێنانی گیراوەیەك لە (ناوی هیندی ajwain) (ناوەکەی بە عەرەبی مەتران گژوگیا) (ناوەکەی بە ئینگلیزی Bishops weed) لەگەڵ زەردەچەوەی سووتاو بۆ بەهێز کردنی ددان و پووك.

ج.دانانی پارچەیەك لە زەردەچەوە لەسەر ددانە بە ئازارەکە، ئەوەش یارمەتی کەم کردنەوەی ئازار دەدات.

د. پڕ کردنی نێوانەکانی ددان بە زەردەچەوەی زەوی ئیسراحەتێکی کاتی دەدات بە ئازارەکە.

ه.غەرغەرە کردن بە تێکەڵەیەك لە زەردەچەوە و مێخەك لە ٢٠٠ گرام لە ئاو بە چارەسەرێکی تەندروست دادەنرێت.

لەگەڵ پاك کردنەوەی ددان بە هەویری پێك هاتوو لە زەیت و خوێ و خەردەل و زەردەچەوە، ئەمەش پووك بەهێزتر دەکات.

٢٢.کێشەکانی گوێ. زیادکردنی ١-٢ دڵۆپە لە زەردەچەوە بۆ زەیتی خەردەل بۆ پاك کردنەوەی گوێچکەکان .

٢٣.کێشەکانی چاو. پاك کردنەوەی پێڵووی چاو بە بەکارهێنانی هەویری گەرمی کەمێك لە زەردەچەوە، ئازار لەناو دەبات، و گرێ و کێشەکانی تری چاو.

ب.کوڵانی زەردەچەوە لە ئاودا و بەکارهێنانی گیراوەی دەرهێنراو لە دوای سارد بوونەوەی لەسەر چاوەکان سوود بەخشە بۆ لەناوبردنی هەوکردنی چاوەکان.

٢٤.بە کورتی، هیندییەکان زەردەچەوەیان بۆ چەندەها ساڵ بەکارهێناوە چونکە سوود و بەکارهێنانی زۆرە لە تەندروستی و خۆراك دا :

أ.مادەی کرکمین، یەکێکە لە مادە کاراکانی ناو زەردەچەوە، کە هاندەرە بۆ دەرچوونی زەردی ، کە دەبێتە لەناوبردنی ڕۆن.

هەروەها مادەی کرکمین کە لە زەردەچەوەدا هەیە دژە هەوکردنەکانە و توانایەکی هەیە بۆ خاو کردنەوەی ئازارەکان و ئازارەکانی کە لە هەوکردن جومگەکانەوە دروست دەبن.

ب.زەردەچەوە زۆر سوودبەخشە لە حاڵەتەکانی نەخۆشی دڵ و دەمارەکان.

ج.زەیتی دەرهێنراو لە زەردەچەوە وەك پاك کەروەیەك بەکاردێت. هەروەها گواستنەوەی بەکتریا لە برینەکان دا ناهێڵێت.

ه.دەکرێت هەویر و مەڵحەم لە زەردەچەوە دەربهێنرێت. لەبەر ئەوەی زەردەچەوە دژە میکرۆب و دژە هەوکردنی بەکتریاییە.

و چەندەها پێکهاتەی سەرەکی لە زەردچەوە دەردەهێنرێت و بەکاردەهێنرێت بۆ زیادکردنی تام و ڕەنگ بۆ خواردنەکان.

ز.زەردەچەوە چەندەها پێکهاتەی سەرەکی گرنگ لەخۆدەگرێت کە لە زۆر لە گیای تردا هەیە.

ح.بەهۆی لە خۆگرتنی چەندەها تایبەتمەندی دژە بەکتریایی، لەبەر ئەوە ڕۆژانە زەردەچەوە بەکاردێت، هەروەها بەرگری دەبەخشێت بە لەشە لەدژی نەخۆشیە حەساسیەتە جیاوازەکان.

هەروەها چەند سوودێکی تری هەیە دەکرێت بەم شێوەیە باس بکرێت:

١. گیای زەردەچەوە کاریگەرییەکی ڕاستی هەیە بۆ خۆ پاراستن و چارەسەری شێرپەنجەی پرۆستات، وە بەتایبەتی بەکارهێنانی لەگەڵ هەندێك سەوزەوات.

٢. زەردەچەوە هەوکردن جومگەیی ڕوماتویدی و ئێسکە نەرمە دوور دەخاتەوە.

٣. زەردەچەوە پێکهاتەیەك لە خۆدەگرێت کە پێی دەوترێت کرکمین، کە یامەتی بەرەنگار بوونەوەی بڵاوبوونەوەی شێرپەنجەی مەمك بۆ سییەکان دەدات. هەروەها زیانەکانی ئەو حەبانەی بۆ شێرپەنجەی مەمك بەکاردێت کەم دەکاتەوە.

٤. زەردەچەوە، خواردەمەنییەکی بەناوبانگە لە کیشوەری ئاسیا، وە لە کۆریا لە کۆنەوە بەکارهاتووە بۆ کەم کردنەوەی هەوکردنی برینەکان و چارەسەر کردنی و کەم کردنەوەی ئازار، هەروەها دەتوانرێت ڕێگری لە نەخۆشی شەکرە بکات، لەگەڵ ئەوەدا دەتوانێ پارێزگاری لە غودەی صماێ بکات لە تووش بوون بە هەوکردن، وە ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێت لە زاڵ بوون بەسەر نەخۆشییەکان دا.

٥. کرکمین، مادەیەکە لە زەردەچەوە و کاری پێك دێت و هەندێ جار تەوابلی تریش، وە بەکاردێت بۆ زاڵ بوون بەسەر نەخۆشیە بڵاوبووەکان.

٦. خواردنی کاری دووجار لە هەفتەیەك دا یارمەتی زاڵبوون بەسەر نەخۆشی (لەبیرچوونەوە) دەدات لە کاتێکی زوو دا و بۆ خۆپاراستن لە خەڵەفاوی. پێکهاتەی سیحری لە کاری و زەردەچەوە ئەوەیە کە لە گیاوە دەستمان دەکەوێت.

٧. خواردنی زەردەچەوە بە شێوەیەکی ڕێکخراو یارمەتیدەرە لە کەم کردنەوەی مەترسی تووش بوون بە کەمی لە دڵ، ئەوەش لەبەر ئەوەی زەردەچەوە لە پێکهێنەرە سروشتییەکانە.

٨. دەکرێت زەردەچەوە ڕۆژانە بەکاربهێنرێت ئەوەش لە ڕێگەی تێکەڵ کردنی لەگەڵ سیستەمی خۆراکی تایبەت بە خۆت. دەرهێنراو لە کاری هێندی تەنها بۆ کەم کردنەوەی هەڵەکانی تووش بوون بە شێرپەنجە و لە بیرچوونەوە بەکارنایەت، بەڵکو بۆ کەم کردنەوەی وەستانی مێشك بەکاردێت، وە کاریگەری هەیە بۆ ڕێگری کردن لە نەزیفی ناوەوەی مێشك و نەزیفی مێشك کە لە دڕانی دەمارەکانەوە دروست دەبێت.

بەهێ



بەهێ بریتیە لە میوەیەك کە لە شێوەی هەرمێ دایە و لەسەر درەختی بەهێ گەشە دەکات، وە لە سێو و هەرمێ دەچێت. زۆر جار بەهێ بە سێوی ئاڵتوونی ناودەبرێت. درەختی بەهێ گوڵی سپی و پەمەیی جوان بەرهەم دێنێت. بەڵام بۆنی گوڵەکان بە وتەی هەندێك بۆنێکی زۆر خۆشی هەیە. دەتوانرێت بەرەکەی بخورێت وەك میوەیەکی کاڵ، وەك سێو و هەرمێ. واز هێنانی بەرەکەی لەسەر دارەکە، یارمەتی نەرمی و جوانی بەرەکە دەدات، بەڵام دەبێت بەرەکەی لە پێش دابەزینی بەفر لێبکرێتەوە. بەری بەهێ لەلایەن زۆر کەسەوە لە هەموو بەشەکانی جیهان دا لە دروست کردنی مرەبا و شیرینییەکان و ساس، لەبەر ئەوەی تامێکی بەهێزی هەیە. وە هەندێك کەسی تر بەهێ بەکاردەهێنن لە خواردنەکان، کوڵاو و سورەوکراو، یاخود زیاد کردنی بۆ ناو چا بۆ خۆش کردنی تام و بۆنەکەی.

سوودە تەندروستییەکانی بەهێ:

١. ڤیتامین C لە بەهێ دا یارمەتیدەرە بۆ دوورکەوتنەوە لە مەترسییە گریمانەکانی کێشەکانی دڵ لەلای پیاوان و ئافرەتان. خواردنی بەهێ بەشێوەیەکی رێك خراو سوودبەخشە بۆ ئەو کسانەی کە دەناڵێنن بە دەست نەخۆشی سیلەوە، وە کەم کردنەوەی جگەر و سك چوون.

٢. دەکرێت بەهێ بەکاربهێنرێت لە هەموو جۆرەکانی حەب دژی ڤایرۆسەکان.

٣. خواردنی بەهێ یارمەتیدەرە بۆ ئەو کەسانەی دەناڵێنن بەدەست قورحەوە.

٤. شەربەتی بەهێ بە چالاك کەرێك دادەنرێت، پاك کەرەوەیە، و نەرم کەرەوەیە، میز دەجوڵێنێت و جگە لە تایبەتمەندییەکانی تر.

٥. بەهێ لە مادە دژە ئۆکسیدەکانە و یارمەتی لاشە دەدات دژی ڕەگە ئازادەکان و بەوەش

مەترسی تووش بوون بە شێرپەنجە کەم دەکاتەوە.

٦. بەهێ بڕێك لە ڕیشاڵ لەخۆدەگرێت، وە سوودێکی زۆری هەیە بۆ ئەو کەسانەی ویستیان هەیە کە کێشیان دابەزێنن و پارێزگاری لە ڕەشاقەی خۆیان بکەن..

٧. خواردنی بەهێ بە بەردەوامی تەنها یارمەتی کاری کۆئەندامی هەرس نادات ، بەڵکو یارمەتی دابەزینی ڕێژەی کۆلیسترۆڵیش دەدات.

٨. بوونی پۆتاسیۆم لەم میوەیەدا یارمەتی لاشە دەدات لە دەست گرتن بەسەر بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن.

٩. دەتوانرێت لەو شەربەتەی کە لە ناخی میوەی بەهێ دەردەهێنرێت وەك چارەسەرێك بەکاربهێنرێت لە دژی ڕشانەوە.

١٠. خواردنی بەهێ بەشێوەیەکی بەردەوام سوودمەندە بۆ ئەو کەسانەی کە دەناڵێنن بەدەست نەخۆشیەکانی جگەر و نەخۆشیەکانی چاو.

١١. بەهێ سوودبەخشە بۆ کەم کردنەوەی قەڵەقی و دەست کەوتنی ئیسراحەتی.

١٢. بەهێ ڕێژەیەکی کەمی لە ڕۆنەکان و کۆلسترۆڵ و صۆدیۆمی تێدایە، بەڵام بڕێکی زۆر لە ڤیتامین C و ڕیشاڵەکان و مس لەخۆدەگرێت.

١٣. شەربەتی بەهێ سوودبەخشە بۆ ئەو کەسانەی دەناڵێنن بەدەست نەخۆشییەکانی دڵ و سیستەمی دەمارەکانی خوێن، و کۆئەندامی هەناسە و کۆئەندامی هەرس ، وەك ڕەبوە و کەم خوێنی.

پێکهاتەی بەهێ لە ١٠٠ گرام:

کالسیۆم: ٨ ملگ

پرۆتین: ٠,٤ گرام

ووزە: ٦٠ (٢٤٠ کگ)

ترشەفولیۆم (فیتامین B٩): ٨ میکروگرام

فۆسفۆر: ١٧ ملگ

ئاسن: ٠,٧ ملگ

کاربۆهیدرات: ١٥,٢ گم

پۆتاسیۆم: ١٩٧ ملگ

مەگنیسیۆم: ٨ ملگ

سۆدیۆم: ٤ ملگ

النیاسین (فیتامین B٣): ٠,٢ ملگ

شەکر: ١٢،٥٣ گم

فیتامین B٦: ٠,٠٤ ملگ

فیتامین A: ٤٠ میکروگرام

فیتامین C: ١٥,٠ ملگ

مادە ریشاڵیەکان: ١,٩ گم

چەوری: ٠,١٠ گم

ئاو: ٨٣،٨ گم

| | | |
|---|---|---|
| ١ | Antioxidants in muscle foods. | Eric A. Decker, Cameron Faustman, Clemente J. Lopez-Bote |
| ٢ | Nutrition and food sciences. | Paul R. Thomas and Robe Earl |
| ٣ | Computer applications in food technology. | R. Paul |
| ٤ | Introduction to food process engineering. | P. G. Smi |
| ٥ | Food experimental perspectives | Margaret McWilliams |
| ٦ | Freezing of fruits and vegetables | Gustavo V. Barbosa-Cánovas, Bilge Altunakar, Danilo J. Mejía-Lorío |
| ٧ | Essentials or functional foods | Mary Katherine Schmidl, Theodore Peter Labuza |
| ٨ | Community nutrition | Nweze Eunice Nnakwe |
| ٩ | New Food Product Development | Gordon W. Fuller |
| ١٠ | Regulation of functional food | Clare M. Hasler |

| | and nutritiuons. | |
|---|---|---|
| ١١ | Food safety handbook. | Ronald H. Schmidt, Gary E. Rodrick |
| ١٢ | Sensory and consumer research in food product design and development. | Howard R. Moskowitz, Jacqueline H. Beckley, Anna V. A. Resurreccion |
| ١٣ | Water activity in food | Gustavo V. Barbosa-Cánovas |
| ١٤ | The Fc and A ٢٠٠٣ book. | |
| ١٥ | Oxford Textbook of Anaesthesia for Oral | Ian Shaw Chandra Kumar, Christopher Dodds |
| ١٦ | Diagnostic Ultrasound | Carol M. Rumack |
| ١٧ | Nutrition in public health | Sari Edelstein |
| ١٨ | Community nutrition: applying epidemiology to contemporary practice | Gail C. Frank |
| ١٩ | Advances in Critical Care Testing | M. M. Muller |
| ٢٠ | Accelerating new food product | Jacqueline H. |

| | design and development. | Beckley |
|---|---|---|
| ٢١ | Natural antioxidaten | fereidoon shahidi |
| ٢٢ | Antioxidant measurement and applications | Fereidoon Shahidi, Chi-Tang Ho |
| ٢٣ | Antioxidants in food | Nedyalka Yanishlieva, Jan Pokorný, Michael Gordon |
| ٢٤ | Phenolics in food and utraceuticals | Fereidoon Shahidi, Marian Naczk |
| ٢٥ | Ingredient Interactions: Effects on Food Quality, Second Edition Food Science and Technology | Anilkumar G. Gaonkar |
| ٢٦ | Food Processing Operations Modeling Ontwerp en Analyse | Joseph M. Irudayaraj , Soojin Jun Joseph M. Irudayaraj , Soojin juni |
| ٢٧ | Processing Effects on Safety and Quality of Foods | Enrique Ortega-Rivas |
| ٢٨ | Emerging Technologies for Food Processing | Da-Wen zon |
| ٢٩ | Verwerking van het voedsel: | AG Gaonkar |

| | | |
|---|---|---|
| | recente ontwikkelingen | |
| ٣٠ | Food Processing handbook | James G. Brennan |
| ٣١ | Thermische Food Processing nieuwe technologieën en Quality Issues | Da-Wen zon |
| ٣٢ | Functional Food Ingredients en Nutraceuticals Processing Technologies | John Shi |
| ٣٣ | Dairy Ingredients for Food Processing | Arun Kilara , Ramesh C. Chandan |
| ٣٤ | Eiwit - eiwit interactive | Harald Seitz , Meike Werther |
| ٣٥ | Food biochemistry and food processing | Yiu H. Hui,Wai-Kit Nip |
| ٣٦ | Food processing: principles and applications | J. Scott Smith, Yiu H. Hui |
| ٣٧ | Handbook of Food Products Manufacturing | Yiu H. Hui, Stephanie Clark |
| ٣٨ | Nutraceutical and Functional Food Regulations | Debasis Bagchi |
| ٣٩ | Food Product Development | Catherine |

| | | |
|---|---|---|
| آلامام الابن قيم الجوزية | الطب النبوى | ٤٠ |
| فريد بابا عيسى | موسوعة النباتات المفيدة | ٤١ |
| الاستاذ يوسف الحاج | موسوعة الاعجاز العلمى | ٤٢ |
| نجوى حسين | العلاج بالآعشاب | ٤٣ |
| د.سمير عبد الحليم | الاعجاز النبوى | ٤٤ |
| د.محمد جهاد شعبان | الطب و الحياة | ٤٥ |
| ترجمة محمد حسان ملص | الاغذية الفعالة | ٤٦ |
| ڤاليا مكر زل | معجم الامراض الشائعة | ٤٧ |
| ترجمة ريما اسماعيل | التداوى بالاعشاب | ٤٨ |
| د.مظفر احمد الموصلى | نباتات طبيعية | ٤٩ |
| احمد حفنى وعادل بن سعد | دليل الحجامة والحجامين | ٥٠ |
| كريم احمد | الحجامة | ٥١ |

لە ساڵی (٢٠٠٨) کەسێکم ناسی بە ناوی(چین لی ) کە لە تاقیگەدا کاری دەکرد کە شارەزەیەکی زۆری هەبوو لە بواری (خۆراک) دا بۆ مرۆڤ ،یارمەتیدەرم بوو بۆ نوسینی ئەم پە رتوکە ئەویش بە پێدانی زانیاری دەربارەی (خۆراک).